ناوی کتێب: پڕبوون لەئاو

شیعری تەها سلێمان

تیراژ: ٥٠٠دانە

چاپی یەکەم- هاوینی ٢٠٠٦

چاپ: چاپەمەنی کارۆخ- بازاڕی سۆز- نهۆمی دووەم

دیزاین و بەرگ: ڕۆڤـــــان

ژمارەی سپاردن: ٥٥٧ ساڵی ٢٠٠٦ی

وەزارەتی رۆشنبیریی حکومەتی هەرێمی کوردستان

# "راکردن لە دڵڕەقی شارو باوەشکردن بەشیعردا"

"کەژاڵ ئەحمەد"

ئەوەی کە ناتوانێت، سەرنجم رابکێشێت لەکاتی خوێندنەوەی پێناسەی شیعردا، دەستەوەستانیە لە پێناسەکردنیدا. ئەگەرچی لەزۆر شوێنی ئەم زەمینە پان و بەرینەدا، هەوڵدراوە پێناسەیەك بۆ ئەم زمانە هاوبەشەی مرۆڤایەتیی دابهێنرێت کە پێی دەوترێت شیعر، بەڵام لەگەڵیکیاندا ئەو هەستکردن بە دەستەوەستانیە دەخوێنینەوە.

ئەوەتا چەند ساڵێکە بەباوەڕەوە دووپاتی دەکەمەوە بۆ پێناسەکردنی شیعرو بەباشترین و جوانترینی لەقەڵەمدەدەم پێناسە بەناوبانگەکەی (ئەحمەد محەمەد سەعید) ناسراو بە "ئەدۆنیس"ە کە شاعیرو بیرمەندێکی لێهاتووی عەرەبە، ئەو پیاوەی وتی: شیعر گەرووی جیهانە.

ئەوەی ئەم وتەیەی "ئەدۆنیس"ی ئازیزی بیرهێنامەوە سیعرەکانی "تەها سلێمان"ی شاعیرە، کە بۆنیخۆشی دنیاکەی ئەدۆنیس بەخوێنەر دەبەخشێ، لایەنی لەیەکچوون



لە نێوان دنیای ئەم کوڕە گەرمیانیە رووناکبیرەو ئەو گەورە شاعیرە بیرمەندەی عەرەبدا گرنگیدانە بەتەکنیکی شیعرو تاقیکردنەوەی نوێ و داهێنانی جوانە لەم بوارەدا.

بەڕای من زۆر کەمن ئەو شاعیرە کوردانەی لەسەر ئاستی تەکنیکی شیعریی کاری گەورەو دیاریان کرد بێت، لەهەندێ لەو دیدارو وتارانەدا کە سەبارەت بەدۆخی سیعری کوردیی نوسیومن، خوێندنەوەم بۆ واقیعی شیعری کوردی کردووەو وتوومە: کە لەشۆڕشەکەی "گۆران"ی نوێخوازەوە گۆڕانێکی ئەوتۆ لەتەکنیکی شیعری کوردیدا نەکراوەو تەنانەت مامۆستا شێرکۆ بێکەس-یش، توانا لە رادەبەدەرەکانی داهێنانی لەسەر ئاستی زمان و ناوەڕۆکە، نەك لەسەر ئاستی شێوەو هەیکەلی ئێسکی جەستەی شیعر، بۆیە من بۆخۆم، لە دوای "گۆران"ەوە هەستناکەم گۆڕانێکی بەرچاو لەدنیای شیعری کوردیدا کرا بێت، ئەوەی کراوەو نوێیە لەئەدەبیاتی شیعریی ئێمەدا، دەرکەوتنی دەنگی ژنانەو شێوازی کچانەی دەنگهەڵبڕینی شیعرییە، کە ئەمە تام‌وبۆنێکی نوێی بەشیعری کوردیی داوە.

هەوڵەکانی تەها سلێمان و ماندووبوونی بۆ خوڵقاندنی تەکنیکی وا کە دەقی شیعریی ئێمە پێی نامۆیە، جورئەت و زیرەکیەکە شایستەی ئافەرینە.

شیعری ئەم کوڕە ئەسمەرەی گەرمیان، وێڕای تەکنیکی شیعریی جوان، دابڕاویش نیە لەناوەڕۆکێکی سەرنج راکێش، کە کسپەی دڵی پاشماوەکانی ئەنفال لەوشەو دارشتنەکانی، هەڵدەستن و بەردو ئاوو خۆشەویستی و حەنینی قووڵ بۆ گەڕانەوە بۆ گوندو راکردن لەدڵڕەقی شار، پێکهاتە دڵگیرەکانی دنیای "تەها سلێمان"ن.





بەر لەکۆتایی پێویستە ئاماژە بەو راستیە تاڵە بدەم، کە شیعری سەنگینی وەك شیعرەکانی ئەم کوڕە گەرمیانیەو گەلێ شاعیری تری جددیی ئومێدی ئەوە لەدڵدا چێ دەکەن کە خوێنەری کورد بگەڕێتەوە بۆ ئاستێکی بەرز لەچێژوەرگرتن و دوور بکەونەوە لە رەواجدان بەو شیعرە سادەو کەمتواناییانەی لەسەر وەزنی هەللور بللور تەکامە دەنووسرێن و دواتر خوێنەری ناهوشیار وا دەکات ناوی پڕفرۆشترین کتێب لەبەرهەمەکانیان بنرێت، کە ئەمە دیاردەیەکە ئاستی نزمی رۆشنبیری زۆرینەی خەڵکی ئەم وڵاتەو بەتایبەتی گەنجەکانی ئەم وڵاتە دەردەخات کە گەنجێکی وەکو "تەها سلێمان"و شیعرە سەنگینەکانی لەپاڵ شاعیرانی تردا بەرپرسیارن لە راستکردنەوەی ئەم بارە لاسەنگەی دۆخی رووناکبیریمان.

# شارێك لەباران.. بارانێك لە دوكەڵ

لەشاردا هەموو شتێ ڕەنگی بارانی گرتووە،
لەبارینی باراندا هەموو توخبەكانی ژیان دەچنەوە سەر ڕەنگی ئەو.
كەتەنیایی‌و باران شار دەڕازێننەوە،
من دەبمە تۆو تۆش دەبیتە هاتنەوەیەكی ترو
بەبێدەنگی بۆ پارچە شكاوەكانی هەستی خۆت‌و ئەو دەگەڕێی.
لەشاردا هێڵە نزیكەكانی نێوان تۆو ژیان،
وەك هەوەڵین موناجاتەكانی هاتن پەیجوری نەختێ سۆزی،
پێش بەیانیان دەكەن.
تۆزێ مۆزیك ئەی مۆزیك ژەنە فەقیرەكە،
بێدەنگیت بەتەنیاییەكانی ڕۆحمەوە دەكرۆژم.
نەختێ سلاّو ئەی سروتخوێنەكەی ئێوارانی پرچ زیووین،
تەنیایی گەروی تاساوت بۆ هەمیشە ئازارم دەداو
وەك فەنەر توێ توێی ناو لەپم شەق دەكا.
لەشاردا منالێك بەبێدەنگی دەمرێ،
كەس پێی نازانێ‌و سۆراخی ناكا.
لەشاردا دەچینەوە سەر ڕەگەزی بێدەنگی‌و
لەشوێن دەمی تەلاّشە بەردەكانەوە خوێن بەجەستەماندا فوارە دەكا.
تۆ قسە بكە،
بزانە كەسێك هەیە لەم شارە گوناهەكانی لەبەردەم باراندا،



بشواتەوەو بۆ ئاهی هەناسەی خوێن بەربوونی ڕۆح بنەوێتەوە؟
لەشاردا ژنێك گودیلەی سپی خۆی دەڕنێ،
بۆ پیر بوونی _نا_
بۆ تەمەنێ كە بەخەسار چو؛
وەرە تەماشای چراكانی شاركە،
كز وەك چاوی خۆشەویستی لێرە دەسوتێ.
وەرە تەماشای ژوانەكانی شاركە،
چۆڵو هۆڵ وەك كەلاوەكانی پاشماوەی جەنگ.
وەرە تەماشای ئاهەنگەكانی شاركە،
پڕن لەخاڵی‌و بۆنی عەتریان لێنایەت.
وەرە تەماشای خیابانەكانی شاركە،
پڕە لەقەپاغی تەق‌و تۆقی شەڕی دۆڕاو.
لەشاردا بۆنی تاعون‌و كوشتنی جوانیەكان دێ،
وەرە تەماشا:
نزیكە گشتمان بەمەراقەوە بمرین‌و
هەواڵ نوسێك ئەم تراژیدیایە نەگەیەنێ.
لەشاردا كۆترە دەیمیلەكان تۆرێنران،
كەس نەبو بەسەخاوەتی خۆی ئاشتیان كاتەوەو
پێیان بڵێ:
لەپاكیتان چۆرێ جوانی‌و
لەهاتنەوەتان تۆزێ عەقڵ‌و
لەئاشتبونەوەتان،
تەوقەیەك وەك خۆتان پاكمان لەگەڵ بكەن.
لەشاردا كەباران نابارێ،
گشتمان ڕوت دەبینەوە لەپاكی‌و

پڕ دەبین لەناپاکی.
بڕۆ لە ئێوارانی تاساوی شار بپرسە،
بزان من شێتم یان تۆ یان شارییەکان،
کەناتوانن وەك خۆمان بمان ناسن.
لەشاردا ئینجانەی گیانەعناکان لەژێر پێی سەربازانی دەسەڵاتدا،
وردو خاش دەبێ‌و
ساقۆی بەری برسییەکان پڕ دەبێ لەدوکەڵ.
تەماشا،
چەپکێك ڕەیحانە لەمشتی ئەو شۆخەدا چۆن هەڵپڕوکا.
ببینە،
ڕەنگی شار وەك سەردەمی بەردین و جەهالەت،
شەلاڵ لەخوێنەو بۆنی سووتان توێ توێی سوقاقی ماڵەکانی گرتووین.
لەشاردا خۆشەویستی دەبێتە خەونێکی سەرمەدی،
سەکۆکانی دانیشتن و حیکایەتی جوان دەبنە بەردە نوێژی جەبر.
کتێبخانەکان ڕستێك وشەی ڕاستی لەخۆ ناگرن،
کەگوزارە بن لە ناسینی یەکتری مرۆڤەکان.
سۆز دەمرێ‌و
ژیان دەمرێ‌و
پۆرترێتی ڕەنگەکان وردو خاش دەبن.
سەیر،
شار چ خۆخواردنەوەیەك دەپلیشێنێتەوەو
چ مەرگێکی نائاسایی قوتی دەدا.
تۆ لەئەو (شێت) تری‌و ئەویش لەتۆ (شێت) تر،
ئاخر ئەو نازانێ  شار خاڵیە لە حەنینی‌و
تۆش نازانیت پەیتاپەیتا مەراق هەردوکتان دەشێلێ.



لەشاردا ئەو دەبێتە ئەستێرەی سیوەیل و
تۆش دەبیتە تارمایی دوکەڵی سوتانێکی هەمیشەیی.
لەشاردا لەجیاتی باران دوکەڵ دەبارێ،
لەبۆنی بارینی دوکەڵدا تۆ دەگەیتە لێرەواری دەریایەك خاڵی لەخۆت،
ئەو بێپشودان هەڵتدەلوشێ‌و
تۆش وەك چاوەڕوانی مەرگ بیت،
هەناسەت سوارو
بەهێواشی گوێت لەترپە ترپی دڵی لەت و پەتبووی خۆت گرتوە.
بیرت دێ ئەو ئێوارەیەی سەرپەنجەکانی من خوێنی لێدەچۆڕاو
ناو لەپی تۆش هێڵەکانی پاکبوونەوەی بەیەکتر دەبەستەوە؟
لەشاردا هەموو شتێ دەدۆڕێ‌و
هەموو ڕەنگەکان کاڵدەبنەوە.
لەشاردا مجەوەری مزگەوتێك بڕیاری بەردبارانی شۆخێك دەداو
قوتابیەکانیشی لەسەر کوشتن ڕادێنێ.
لەشاردا بۆنی بخوردی نێو پرسەکان گوێی دوا ترۆقەی دوگمەی،
دارگوڵە باخەکان دەسمێ‌و
بەرماڵی نوێژی کچێکی قەیرە بۆ چارەنوسی خۆی،
پڕ دەبێت لە قورقۆشمی فیشەکی جەلادەکان.
شار پڕ دەبێت لەسۆزانیە عەمامە لەسەرەکان،
گومەزەکان پڕ دەبن لە قیژەو هاواری جاڕدانی شەڕ.
تەماشا:
هەنگاوەکان لەشاردا لەبازنەی ترسدا دەڵمێنەوە،
ترس بووەتە خاوەنی هەموشتێ‌و توێ توێی گەنەموەکانی بندەستمان،
بۆ مەرگی سەرمەدیی دەگەڕێ.
تەماشا:

ڕەشێنەی چاوی داپیرم کز بوون و باپیریشم،
بۆ هەتایە خۆی بە گەواڵە هەورێکی تووڕەو خێرادا هەڵدەواسێ.
ئەو دەڵێ مەخلوقێك بەڕێوەیە جوان پەرست نین و
لە خۆشەویستی تێناگەن.
تەماشا:
لەنێو پشکۆی کوانووی سوتانی  شاردا،
منالێك بۆ چوکلێت دەگری و
مەودای فڕینی ئازادی بێچوی کوختیەکان تادێ تەسکتر دەبێ.
تەماشا:
ژێی پچڕاوی ئەو گیتارە چەن بەکوڵ دەگری و
مێخەکبەنی گەردنی ئەو گوڵە شۆخە،
لەسەرمێزی پارەو جەستە چۆن بێمنەتانە هەڕاج کرا.
شار تریفەی مانگی تیا ئاوا دەبێ و
دەبێتە مەرزی سڵەمینەوەی هەموو هاتنێك.
شار ناتوانێ ببێتە پەناگەی تەریقبوونەوەی ئەو شۆڕەژنەی،
تێزابی دژە مرۆڤەکان کردی بە برژانستان.
شار قومێ ئاوی پاکی تیا نەماوە بیخۆینەوە،
تکایە ئاگادارین.
برۆ لە قەراغی ئەو ڕوبارەی کەهەمیشە بەتەنیایی دەڕوا،
تاوێك بەهێمنی دانیشەو لەئەو بپرسە:
تەنیایی یان هاوڕێیەتی مەخلوقێکی خەسێنراو،
جوانە.
وەرە بەتەنیشت ئاهی دوایەمین هەناسەمدا تێپەڕبە،
بزانە من
یان تۆ



کاممان تەنیاتر لەشارو تەنیاییەکانی دەسوتێین.
تەماشا:
برینێك کەوتۆتە ناو لەپم شوێن ئەو ماچەی بۆ تەنیا جارێك،
بەئەدەبەوە هات و
بەڵام ئەفسوس بۆ هەمیشە تەنیاتر لەخۆی جێی هێڵام.
سەیر کە سەیری ئاوابوونی تارمایی دواهەنگاوی سەفەرێك تەنیا،
لەخۆم و خۆت دەچێ.
لەشاردا نامەکانی خۆشەویستی ناگەن،
شار بووەتە زینهارو
تەریقبوونەوە خوویەکی هەمیشەیی.
من چی بکەم لە شارێك،
پڕبێت لە نەهەنگی برسی و
ناشیرینی و برسێتی چاخی بەردینی لێبڕژێ.
دوکەڵی سوتانێکی سەرمەدی پەیتا پەیتا قانگمان دەدا،
بەدەم پێکی شەراپێکی هەنارییەوە نینۆکمان هەڵدەکێشێ و
بەپەنجەی شەهادەتیش دەڵێ:
هیچ زیرۆحێك بێ یاسای من لێرەوە هامشۆ ناکا.
شار خاڵییە لە سروتەکانی جوانی و
پوزەوانەکانی بانگی خۆشنودی لەژێرابەکانی شاردا خنکان.
تۆ تەماشا...
ئێوارە زێوینەکانی دەمەو خۆرئاوا بوون،
پڕ بوون لە قوڕقوشمی ئیرۆسییەتی پیاوە شەڕانیەکانی کوڕی شەرعی جەنگ.
تۆ تەماشا...
ئێوارەیەك وەك خۆم و لە ڕەنگی تۆدا،
مەست دەبم لە پیاسەیەکی ناوشار.

کەچی پاش چەن ساتێك خاڵی دەبمەوە لەخۆم لە تۆ،
سەر دەخەمە سەر ئانیشکی ئەژنۆم و
جارناجارێك لە سورمەی باڵی ئەو پەپولەیە دەنوارم،
کەلە فەقیریدا کوت و مت لەتۆ دەچێ.
(من کوڕی شەرعیی کوێرە گوندێکی ئەم پێدەشتی گەرمەسێرەم،
لەوێ خۆم بەئازارەوە ناسی و
پرسیار بوو بە بەشێك لەبونم)..
تۆ تەماشا...
ئەمە قسەی ئەو تارژەنە پەنجە براوە بوو،
کەبەبڕینی پەنجەیشی نەیانتوانی ئاوازەکەی لێ بشێوێنن.
(کەس نەیتوانی وەك خۆم بمنوسێتەوەو
پرچی خوێناویم بە شانەی شیعر داپێنێ)
تۆ تەماشا...
ئەمە قسەی (نیگار) بوو،
کەخۆشەویستی نەناسی و
جەللادێك کردیە مەزەی مێزی شەوێکی مەغرور.
(تکایە چۆڕێ هاوڕێیەتی)
تۆ تەماشا...
ئەمە بانگی ئەو مرۆڤ دۆستە بوو،
کەکەس بەپیرییەوە نەچوو.
(تکایە نەختێ پاکی)
تۆ تەماشا...
ئەمە قسەی ئەو پیرە پیاوە حیکایەتخۆشە بوو،
کەکەس گوێی لێنەگرت و ڕۆیی.
(تکایە لەتێ نامەو دوو سێ ڕست نوسین)



تۆ تەماشا...
ئەمە قسەی ئەو بوو،
کەکەس نەیپەرژا ئاوڕی لێداتەوە.
پڕمکە لەخۆت ئەی پاکترین وشە،
تۆزێ لەخوار هێڵەکانی بوونەوە بۆ پارچە شکاوەکانی جەستەم بگەڕێ و
لەتەمەنما کە خاڵییە لەساتەکانی خۆشنودی؛
ڕێژەیەك شادی چێبکە.
شارم وەك خۆی لێبستێنەوەو
هەڵمژەنە لە لەزەتی تورتی خەرنوکەکانی ئۆمەر شوان.
بمبەرەوە پاشماوەی گەمەی کێڵە بەردینەکانی مناڵی و
ئاشتم کەرەوە لەگەڵ ئەو کلاوکوڕەی زۆر لاسارانە هێلانەکەیم تێکداو
گشت یادەوەرییەکانی مناڵیم وەك خۆی پێ بکە بە شیعر.
لەوێ لێگەڕێ نوێژ بۆ سروتی ڕەشبەڵەکی کچانی گوند بکەم و
داوای لێبوردن لەو کۆترە شینکەیە بکەم کە بەدارلاستیك باڵەکانیم شکان.
ئای ئێستا چ گەڕۆکێکی سەرەڕۆ
بوونێکی پەژموردەم.
لەماڵپەڕی شوشەی پەنجەرەی مناڵیمەوە دەڕوانمە کەروێشکەی گەنمە قەنارییەکان و
تراویلکەی پاش تیاچونیکی هەمیشەیی.
ئای ئێستا چ زامێکی قوڵ و
هاتنێکی پڕ ئێشم.
پەلە بکە بۆوەی لەهاتنما تەنیایی بۆ ساتێ جێت بێڵێ و
بوونت لەهەموو ناشێتییەك داماڵێ.
وای ئێستا چ ئێشێکم لێدەڕژێ .
ئای ئێستاچ خەمێکی گەورە دەمگوشێ.

لەناو لەپما پۆیلانەی بەرتەویڵی تۆم دۆزییەوەو
لەهاتنتا بونێك تەنها لەخۆی دەچێ.
ئەی شرین ترین یادەوەرییەكانی منالٌیم،
بۆچی وەك خۆت ئەم هاتنەم لەئاوازی گۆرانیەكانت هەڵناژەنی؟
پرسیار بكە:
ئەرێ ئەم  شارەی ئێمە كەی پڕ دەبێ لەباران؟

٢٠٠٥



## بۆنی ژێر پێی سوڵتان

_١_

بۆ ئەو كرِوكاسە شتن
لەگشت ئەو كاتانەی من لەخۆمدا ون بووم و
نەمدەتوانی باوەڕ بە خواوەندەكان نەكەم
ئەگەر بەرد گوێی هەباو قسەی پێم دەووت:
وەسێت بێ لای تۆ لەسەر نەعشی من و زەنە
تەنها ئایەتێك بنووسن، بنووسن:
"ئەم كوڕو باوكە هێند فەقیرو ساویلكە بوون سیاسەت زەفەری پێبردن و
لە ئاوێنەی خۆشەویستی بێ بەش بوون، نەیانتوانی پاكبنەوە لە
گوناهی نەكردەو سنوری بڤەكانیان بۆ تێك نەشكێنرا، دنیا چی
ئاشوبێكە دەخیلە"..!

_٢_

ئێستا سەرێك بۆ رۆخی زەریاو
هەنگاوێك بۆ ماڵی لەشیوەنی مەلۆتكەكەیەك كە لەپاشماوەی ئاشووبی
ئەم نیشتمانە داوە كەنار كەوتبوو،
دەبەم
ئێستا حەوسەڵەی دواندنی خۆم نییەو
زیرِوحێك ناپەرژێتە سەر دڵدانەوەی حەسرەتەكانم





ئێستا سۆزێك شك نابەم بمخاتە سەر نۆتەی شەپۆلی باڵەكانیو
مناڵیش لە خۆمدا نابینمەوە تا عەجولانە بڕۆمەوە تەنیشت ئێوارە نشینەكانی
+دەمەو ئێوارانی گوندو تەفسیرە لائوبالیەكان ئەزبەر كەم
نەمتوانی _ناتوانم
قەناعەت بەو چۆلەكانە بكەم تا عوزر خوایم قبووڵ بكەن كە ئازارم داون.

_٣_

بەرد
نە
قسە
نە
چاو
نە
بیستن
نە
مردن
ژیان
نە
خواردن
نە
خەوتن
نە
تورەبوون
دەزانیٚ ..ئەو هیچ نازانیٚو
هەموو شتیٚ قبووڵ دەكا
دەزانیٚ ئەو بە هێمنییەك وێنەی خۆیو بەس تەماشا دەكا



بەرد،
قسە بكە تا بمەوە هاوڕێت
بەرد،
چاو هەڵبێنە تا تێر تەماشای یەكتر بكەین
بەرد،
بمرە تا پێكەوە بمرین
بەرد،
بژی تا پێكەوە بژین
بەرد،
بخۆ بۆ ئەوەی پێكەوە تەژی بین لە عەزاب
بەرد،
تورەبە با زووتر ئاشت بینەوە
بەرد،
بم دوێنە تا باس و خواسی ئەم دڵ لەتو پەت بوونەت بۆ بگێڕێمەوە تا قەناعەتت پیٚ بكەم كە سەربازەكانی سوڵتان هاتن و هەر لێرەدا سەمای چۆلەكەشیان سەر بڕی. ئەوان لە جیاتی مەمكەمژە فیشەكیان خستە دەمی منالان. لە جیاتی نان تاعوون. لەجیاتی ماچ گازی كەڵبەی پڕ زەهریان. سەربازەكانی سووڵتان لە هەر هاتنێكا بڕیارێكی (ئەو) یان دەهێنا، بە گەروی دڕاویان جاڕیان دەدا:
لە سووڵتانەوە، بۆ هەموو ڕەعیەتی مەملەكەت
بڕیاری سووڵتانەو
پەشیمان بوونەوەی بۆ نییە
بڕیاری سووڵتانەو
پەلەكردن لە جیبەجیٚ كردنی
باشترین یادداشتە بۆی
بەرد، بم دوێنە





تا شەرحی سەقەت و سقووتی ئەلف و بیّی کتێبی پۆلی یەکی سـەرەتایت بۆ بکەم تۆ دەزانی سەرۆك جەلادەو وێنەکەشی وەك (چاو) لـە لاپـەڕەی یەکەمدا پـارێزراوە. بـەرد، پەشـیمانم لـەوەی نـەمزانی جیـاوازی نێـوان قوتابیو سەرۆکی جەللاد ناردنی کتێبی پۆلی یەکەمی سەرەتاییە، چیـت بۆ تەفسیر کەم بەرد. مەگەر تۆ بڕیارت نەداوە هاوریّ ئـەم بوونـەی ئێمـە نەبێت و بۆ ئێمەش خەفـەت نـەخۆی، تـۆ خـۆت وات وتـووە: ئـەو هـەموو سوولّتانەی هاتن، ئەو هـەموو سـەربازەی لـێرەوە تێپـەڕ بـوون، ئیـتر کـە ئێمەت بینی نە قسەت کردوو نە وتیشت: ببوورن کاتی سەردانیم نییـە! بـۆ بەرد! چون بەرد! نەکەی بەرد! ئەم هەموو دلّ رەقییەت بۆ بـەرد! بمدوێنـە بۆ ئەوەی ببم بە هاوڕێت و یاخی بم لە هەژموونی ئەم دوورگـەی پـڕاو پـڕ لـە وەیو ئاشـووبە، سـەیرکە ئاشـووب تـالّ تـالّی مـووی چەناگـەی وەراندین و زیکرو سۆزی ئەڵلاوەیسی لیّ کردین بە پرچ رنـین و شـیوەن. ئاشووب نەیهێلاّ نە(یوسف)ێك رزگاری بـیّو نـە(زلّێخـا)یـەکیش مـووروی گەیشتن بە مەراز بدا لە یەخـەی سـوخمەی، یوسـفەکانی چـەند فـەقیرو زلّێخاکانی چەند بیّ چارە، سـلاّو یوسـفی بـرا دلّ گـران مەبـە لـەوەی نـەتتوانی بـە بـای بـالّی چۆلەکەیـەکدا پـەیامی سـەلاّمەتی خـۆت بـە قەبائیلەکەت بگەیەنی، سلاّو زلّێخای تەژی لە عەشق. زویـر مەبـە لـەوەی یوسفێك بـۆ تـۆ هـات و دابـڕان جێگـای ئـاوێزانبوونی لێگرتنـەوەو ئیـتر سلاّمەت خۆت عادەتی ئەم کەونە سەخیفە وایە.

سەیرکە بەرد

بەربەریەت هوروژمی هێنـاوە، کلاّوکوڕەکـان تـۆران کوڕکوڕەکـان کـە دەڕۆن مالّئاوایی ناکەن، پەڕەسێلکەکان وازیان هێنا لـە دووعـا هەمیشـەییەکانیان دژ بەوەی مالّیان تێك دەدا. سوێسکەیەك نەما دوغەدووغ بۆ دیتنەوەی هاوڕێکەی بکا، کوختییەك نەما بۆ (با)ی فێنکی ئێوارە عەسرێك ناخوێنیّو ماسـییەك لـە نێو دەریادا موبتەلای چۆڕیّ ئاوە، بەرد هەناسە خاکییەکانی تـۆش مـاندوون و ئارەزووی دەمەتەقێیەکی تریان نییە.



-٤-

کیّ دەزانیّ جیاوازی نێوان
دلّی
گەورەی بەرد
سەبری
گەورەی بەرد
حەوسەڵەی
گەورەی بەرد
لەگەلّ
دلّی بچووك و سەبری کەم و حەوسەڵەی کەمی ئێمە لە کوێدایە؟
ئێوە جیاوازی لە نێوان پێغەمبەری خواو سولّتان دەبینن؟
بەرد گویّ بگرە لە نۆتەی مۆسیقاکانی ئەو تارژەنە پەنجە بڕاوەو
گۆرانییەکانی شەمالّی هەر چوار وەرزی سالّ
بەرد بۆ قسە ناکەی؟
مەگەر هەر خۆت تەفسیری ئەم پرسیارانە بکەیو ئەنجامەکەشی قبولّ بکەی
پێم نالّێی
چاوەڕوانی چی لە رەعییەتی کاسی بۆنی ژێر پێی سولّتان و
کانییەکی کوێرەوە بوو، عەشقێکی بە سوتماك بوو دەکەی؟
بەرد تۆ نازانی هاکا سولّتان تۆشی دزی!؟
بەرد کە سولّتان تاعونی هێنا
گشتمان خراینە نێو تابووتی مەرگ و فیراقەوە
کە تاعون هات
تەنها چاوەزاری بەر تەوێلّی منالّێك، کل و کلدانی شۆخێکی
قەساس کراو بۆ شکایەت ئەرزو حالّیان بردە بەردەم
بارەگای خوا، مالّی خوا،وەکیلی خوا، ئەویش بیّ وەلاّم و لالّ بوو

تکا دەکەم بەرد
ئایا دەتوانی پێکەوە حیکایەتی رسالەی زریانی ئاشووب و تاعوون
بنووسینەوە؟
بنوارە
ئاسمان بە ئەستێرە لەگەڵ جوانی مانگ و مانگ لەگەڵ ژووان و
ژووانی خۆشەویستی لە گەل ئەم رەعیەتە ترازا
ئەوەتا کەس ناتوانێ بزانێ بەرەگەز دەچیتەوە سەر رەگی ئاو-یان خۆڵ
ئاو-بۆنی ژێر پێی سوڵتانی لێ دێ و
خۆڵ- بستێکی بێ خاوەن نەماوە
بە دیار بێ دەنگی تۆوە وا نزیکە تەژی بم لە هیچ بەرد.

-٥-

دایکم چارەیەکی شك نەدەبرد بێ لە تەمبیەکردنم بۆ ئەوەی لە کۆڕی
ریش سپیانی گوندەکەماندا زۆر وەرگرم و کەم بڵێم
چی وەرگرم بەرد ئەوان هەمیشە سڵاوتیان بۆ خواوەندێك دەدا
گوێی کەڕ بوو
چی وەرگرم دایە کە ئەوان نەتوانن مناڵی من لە باوەشی حیکایەتەکانیاندا
پڕ کەن لە جوانی وتنی شیرین، چی ببیسم خودایە کە ئەزانم بەرد بۆچی قسە
ناکاو بێدەنگی بۆتە ماڵی، بەرد من زنجێك شك نابەم تیایدا ئولفەت
بە بێ دەنگییەوە بگرم، چۆڕێ ئاو شك نابەم گەرووی وشکمی پێ تەڕ بکەم،
تۆیەك شك نابەم بمخاتە سەر پشتی خۆی و لە رێژگەی ئەم تاعوونە
بمپەڕێنێتەوە
ئافات هات بەرد
تەنها من لەعێلی قەبیلەکەم رزگارم بوو
ئێستاش پەرت بووم و
لە ئاوێنەی پەشیمانیشدا خۆم ناناسمەوە



ئەوەتەی کتێبم دیووەو پرسیارم کردووە
جوگرافیای ئەم نیشتمانەی من تێکشکاو بووە
دەگێڕنەوە تۆش قبوڵت نەکردووە
لە سەر پشتی تۆوە بپەڕینەوە
ئافات هات بەرد، تاعوون هات بەرد، زریانی شووم بەڕێوەیە بەرد
ئێستا من- ئێمە
بێوارترین مەخلوقین و
هیچ خواوەندێك ناپەرژێتە سەرمان
هیچ وەرزێك لە وەرزەکانی ساڵ نامانگرێتە خۆ
بەرد تەماشا
چرای دەلیلەکەشمان کز وەك چاوی ئەو پیرێژنەی کە هەمیشە
بۆ قوربانییەکانی ساڵی تاعوون دەگری — دەسووتێ..

-٦-

ناچمەوە پاشماوەی ئەو گوندە ڕووخاوە، لەوێ هەناسەکانی مەهدی(٢)خنکا، شیعرەکانی مەهدی تیرۆرکرا، فاتیحای دایکی مەهدیمان خوێند، دڵی دەزگیرانەکەی مەهدیمان بەقەدەر ناشت، گوندییەکان چاوەڕوانی گەڕانەوەی مەهدین، لەمەنفادا مەهدی هەموومانی تەڵاق دا، لەوێ مەهدی بێپارەو پوول بێچای ڕەش دەژیا، ئەو تەنها هۆگری(لادێییەك چوو بۆ شار وای وت)بوو، بەرد تەماشا وا مەهدی(لیسای) بەزمانی خەتە مسمارییەکانی( بنەی خەپەکوێر)(٣) نوسییەوەو بەمەنفای وت: لەهەرکوێیەك بم ئیلهامەکان ئیلهامی هۆنراوەو هێوەر بوونەوەو ئیسراحەتمن، ئەز ناچمەوە بۆ ئەو گوندە لەوێ خیابانەکان پڕن لەتاعوون، لەوێ سەگێك پاسەوانی تاعوونەو هەر ئەویش هاوڕێی دەستە ڕاستی سووڵتان، لەوێ داپیرەیەك هەیە هەمیشە ئەم قسەیە لەسەر زارییەتی: ئێرە پەرداخێ ئاوی تیا نیە بۆ خواردنەوە، لەوێ پیربووین و تاقەتی موتاڵای تەفسیرەکانی عەشقیشمان چوو.





ببینە بەردی هاوڕێ:
ژیان پیر بوو
ژیان خیانەتی لێکردین
ئیلهام خیانەتی لێکردین
گوند خیانەتی لێکردین
تەنها تۆ ماوی بەرد بمدوێنە

_٧_

دەزگیرانەکەم ڕۆژێ بەترسەوە پێی وتم ئەم کەونە جێی من و تۆی تیا نابێتەوە، مردن بەشێکی گەورەیە بۆمان کەچنگ ناکەوێ، ئەو ڕۆژێکی تر هات و وتـی: بـڕوا مەکـە (گۆدۆیـەک) بێت و بمانخاتـە دواسـیپەی مـاڵی دڵنیـایی خـۆی، لەدیتنێکی دەستەو یەخەشدا پێی وتم: ئیت ربۆ هەتایە چۆلەکەکان مەرحەبامان ناکـەن و کۆترەشـینکەش پێمـان نـاڵێ بـەیانیتان بـاش، مامۆسـتاش وانـەی چاوێلکەی نەنکم ناڵێتەوە.

_٨_

ئەمڕۆ قوتابیە ئازیزەکان
هەمووتان دەچنەوە ماڵەوە
بەکەس مەڵێن من لێرەم
من و یادەوەرییەکانم جەدەلێکی تووندمان لەنێواندایە
دەبێ یەکمان ئەوی تر بۆڕدا
لەسەر ئەوەی من یان ئەو زووتر تەلاقنامەمان بۆ یەکتر نارد
مەڵێن لەماڵەوەیە بۆوەی
مەرگ تەنها ئەمشەو مۆڵەتم دا
ماستەرنامەی وڕێنەکانم تەواوکەم



_٩_

ئەو فرمێسکانەی پاین پێڵوی چاوت بسڕە
ئەوە تۆ بووی بەرد
ئەوە خۆت بووی قسەت کرد
یان من گوێم زرینگایەوە
قسەبکە بەرد
من خەوتبووم و
خەونم دەبینی
یان تۆ قسەت دەکرد

_١٠ _

بۆنی ژێرپێی سووڵتان دێ
بۆنی بۆگەنی دەمی سووڵتان دێ
بۆنی ئاشووبی بڕیارەکانی سووڵتان دێ
بۆنی بەربەرییەتی سووڵتان دێ
سووڵتان هات بەرد
دەیەوێ لەسەر پشتی تۆوە نیشان لەکچە تازە باڵق بووەکان بگرێ
دەیەوێ ئەمشەو نیشتمان بکاتە نۆبووک و
داوەتی سوڵتانی گەورە بکا
هات بەرد
سپێنەی چاوی پڕ بووە لەخوێن و
بیرتە یەکەم جارکەهات دەزگیرانەکەمی ئیغتساب کردو
پرچی نەنکمی بڕی و
چاوێکی خۆشمی بەتیرو کەوان کوێرکرد
گوێ بگرە بەرد
دایکم ئێژێ تۆ قەرزداری بەردی

چونکە هەمووکاتێ سێبەری ئەو
دەبوو پەناتو
بۆ خۆت ورد ورد
لەسەرابی دەوروبەرت دەڕوانی
دایکم ئێژێ ئەوسا
دەرکم پێکرد بوو
کەرۆژێ ئەم هەموو عەزابە دەنوسیتەوەو
هەر ئەویش دەتکا بەرەژوو

_١١_

لێم ببورە بەرد
عوزر خوایم قبوڵکە
تکایە من گەرۆکێکی دۆزینەوەی
نهێنیەکانی تۆم
من پرم لەنهێنیەکانی تۆ
پرم لەقەرزداریاری تۆ
پرم لەحەوسەڵەی گەورەت
بەرد تکا دەکەم بمکە هاوڕێ

_١٢_

مەلای گوندەکەمان سەر زوبان و بن زوبانی دەڵێ بەو قوورعانەی ناوی خوام لێهێناوە، خودایە نەمەلای گوندەکەمان و نەقوورعانەکەی تۆ بەنووزەی کەسەوە نەهاتن، خودایە تۆش نەتتوانی بەسوڵتان بڵێی پشتی چاوت برۆیە، نەتتوانی لاشەی بەقەرەبرووت بووی چۆلەکەیەك بکەیتە شاهیدی ئاشوبەکانی سووڵتان.



_١٣_

مەعزەرەت لە گەرووماندا تاساو پەیکوڵ ژێر پێمانی خوێناوڵ کردو
جەلەی پیشۆکەکانیش بە پشتێنمانەوە دزرا
ئیتر باخچەیەك بۆ ماڵی خۆیمان بانگ ناکاو عینوانی خۆشەویستمان
پێ ناڵێ
ڕەووەزەرێیەك نییە بچینە سەرپشتیو بمان گەیەنێتە ماڵی بێ سروەی بیابان
لەوێ لەپاڵ گوێ بەرخەیەکدا سەر خەوێك بشکێنن و
لەوێ هەموو شتێ بەیەکسانی لەگەڵ بیابان دابەش دەکەین
تەنها مێخەکێك لەگەڵ خۆم دەبەم و
لە ترسی بۆنی بۆگەنی دەمی سوڵتان دەیکرۆژم
لە ماڵی بیابان لە باران دەپارێمەوە وەك بەردم لە گەل نەکاو زوو داکا بۆ
ئەوەی لە بۆنی ژێر پێی
سوڵتان پاك بمەوە
بەرد بۆنی سوڵتان ئەم ناوەی گرتووە
بەرد من تاقەتی تەماشاکردنی دیمەنێکم نییە خۆم سووتەمەنی بم
هەر خۆیشم چاوەڕێ بم
بەردی سالار
کەی برۆین و ئەم کەونە تەلاق دەین!

-١٤-

لێم ببورە-بەرد
نەمزانی-بەرد
سەرم ئێشاندی-بەرد
هاوارم زۆر کرد-بەرد
کەس نەبوو-بەرد
کەس نەیدواندم

تەنانەت تۆش

-١٥-

دەگێڕنەوە جارێك بەردێك بە نوێنەرایەتی كۆمەڵێ زۆر لە دەوروبەری
نامەی شكاتی بردۆتە لای خواوەندی عەرش، ئەویش پێی وتووە
هەر لە خۆت دێ بێدەنگی
من پەشیمانم بەرد بە منالّی عەجولانە بە هەنگڵی گیانەوەرانمدا دەكێشایو
تۆ ئەوساو ئێستاش هەر قسەت نەكرد، هیچت نەوتو تەنها بە روخسارتا
دیار بوو وەڕسو دڵگرانی لە گەورەكانمان كە ئێمەیان وا فێر كرد
دایكم غەدری كرد دەیووت: بەرد چەكی دەستە! بەرد فەقیرو سەنگینە،
وتوویانە
تەنها جارێ بەرد وتوویەتی:
لە سەر گازەرای پشتم بنوسن (عەیامێك
چەكمە لە پێكان هاتنو تۆوی ونبوونی جوانیان دزیو
گەورەو بچوك بوون بە فیرعەونی ئەم كەلاوەیە)
سوڵتان هات
ئاشووب هات
تاعوون هات
ئەو هەر قسەی نەكردو..

مانگی ٢٠٠١/١٠/٩

*ئەم شیعرە لەگۆڤاری (هەشتاوهەشت)بلاْوبوەتەوە ژمارە(١) ساڵی ٢٠٠٤

پەراوێز
١-زەنە یەكێك لە جگەرگۆشەكانم
٢-مەبەست لە شاعیر (مەهدی ساڵحی هاوڕێم).



# سەفەرێكی سپی... موسافیرێكی شەرمن

## سەفەرێك وەك خۆی

باوكم وەك سپێتی ڕووحی خۆی
ماچی شعوری داپیرمی لەسەر تاتەشۆری مەرگ كردو
بەسڵاواتێك كە پڕ بوو لەنوری پاكێتی داپیرم
هەمووانی گریاند
باوكم لە نوێژ كردنا
لە جارێ زیاتر سوجدەی بۆ ڕۆحی وردو خاشبوی داپیرم
دەبردو
سەبوریم بە تۆ دێ ئەی سەبورترین ماڵی من
باوكم هەمیشە كەیلی ئەوە بوو
كە داپیرم لە غروبێكدا لەدایك ببوو
دواین جاریش لەغروبدا
دواترپەی داڵی جێهێڵاو
مووژگانی چاوی عەشقی بۆ هەتایە لێكنا
باوكم وەك خۆی سپی بەیانی باشی دەكردو
وەك خۆی شەرمن چاوشاركێی لەگەڵ پەنجەرەی

عەشقا دەكرد
كەباوكم مرد
وەك ڕۆحی ئەو تەنیا
بووم بەسەفەرێكی سپیو
موسافیرێكی شەرمن
حیكایەتەكەت لە كوێوە دەست پێدەكەی؟
ئەو دەزانیٚ یان تۆ؟
حەرفەكانی خۆشنوودی كەی چرۆ دەكەن؟
باوكم هەموو شەویٚ خەون دەبینیٚ
لەخەونیدا من و ئەو دەچینە دیدەنیو
دەقی مووناجاتێك لە عەشقی بۆ دەخوێنینەوە
ئەو پرسیاری داپیرم دەكا
من و تۆش پرسیاری تەهارەتەكانی عەشق
ئەو پرسیاری دواین سۆزی كوڕەكەی (عەلی)و(١)
من و تۆش پرسیاری گریانی هەمیشەیی
مەنسور(٢)
دەكەین



# سپی وەك ڕۆحی خۆت

سەفەرێكم
وەك باوكم
وەك ئەو
وەك هەرتكمان
مێژووی موناجاتێك دەنوسمەوە
وەك خۆی سپی
ڕۆحم بۆ هەمیشە تاسەی پڕ بوون
لە گەورەیی (ئەو)ەوەو
دیبەم لە چاوەڕوانی هاتنیا
بەردێكی گریاوە
بیرم دیٚ بۆ یەكەمین جار
دایكم پڕ بەعاتیفەی ماچی كوژەكەی ڕۆحی
منالّیمی كردو
نوشتەیەكی لە ئاو كرد بە بەرۆكما
بیرت دیٚ تۆش نوشتەكەت لە یاخەم كردەوەو
كردت بە یاخەی خۆتاو
ماچی نێوچاوانی دایكمت كرد
نوشتەكەت كردەوەو
ئەم دێڕەت تیا خوێندەوە:
(سۆراخی نۆبەرەی شكاوی ڕۆحم دەكردو
تۆ هاتی بۆ هەتایە بووی بە هەتوانی)

دایکم بە لوتفی خۆی ڕۆحی لە گوناه شتم و
وەك خۆی سپی کردمەوە لە مووناجات
تۆش هێمنی وەك سپێتی ڕۆحت
پەنجەرەی حوزن و تەنیایمت ترازان و
بە ماچێکی هەناری سەر پەنجەمت
وەك دوا چۆڕی خوێنی دڵت
ئاڵ وەك خۆم و خۆت
ئاڵکردەوە



## وەك خۆت هەمیشە سەفەر

لەباوکم و دایکمەوە فێر بووم
گوێت لێبگرم
لەئەوان و تۆوە فێر بووم
بەردەوام سەفەر بگرمە باوەش و
کڕنۆش بۆ ئەو هەناسە شکاوانە ببەم
کەبەڕەگەز دەچنەوە سەر(ئەو)
ئەگەر(ئەو)
مانگ و
باوك و
ئەستێرەو
دایك و
چۆلەکەو
سپێتی ڕۆح و
سەفەرو
موسافیرو
بەردو
بێدەنگیو
هێمنیو
تەنیاییو
هاوڕێو
عەشقی،

خۆش بووێ
من دەبمە کوڕی شەرعی ئەوان و
تۆش دەبیتە پارچەیەك لەمن
وەك من هەمیشە هاتن
پێش هاتن گۆرانیم بۆ دڵتەنگ ترین مەخلوق
دەچڕی
کە تۆ هاتی
بێ تاقەتیەکانی ڕۆحت گرتمە باوەش و
گۆرانی یەکەمین ساتەکانی تەعاروفت
بۆ کردم بە پۆیلانە
وەك دواجاریش نامەیەکت نووسی:
بیێ زەحمەت ڕووخسەت بفەرموون
دەمەوێ ئەمشەو مێژووی گەورەترین خەون
بنووسمەوە
لە خەونما دەریا شێت بووەو منیش تکای لێ دەکەم
لەگەڵ خۆیم ببا
لە سێبەری سپی رۆحی خۆم و خۆت و دەریادا
بە شۆفێرە هێمنەکەی دەریا دەڵێم
گوێگرە
رۆحم پڕاو پڕە لە حیکایەتی کوژراو
تەمەنم پڕاو پڕە لە خونچە گوڵی ژاکێنراو
ئەگەر تۆ تاقەتی مووتالای گوێ گرتنت هەیە
لە شینایی ڕوحی خۆتدا ماڵێ بۆ من چێکە
تا حیکایەتی هاتنم وەك (ئەو)
بگێڕمەوە



## سپی تر لە(ئەو)

لە خوا سپی تر
لە خوا نورانی تر
ئیزنت لە خەونێکی
باوك و دایکم
خواست و هاتی
لە خۆت سپی ترو
لە من سەبورتر هاتی

# له(من) سپی تر

تەماشا
پارچەیەك لە ڕوحت میوانی منەو
لەگەڵ ڕوحی منا
حەرفەكانی شەهادەت
حەرفەكانی شەهادەت
بۆ عەشقی یەكتر
لەسەر دڵ بەردێك هەڵدەكۆڵم
بەردێك بوو بە حیكایەتخوانی
هاتنی سپێتی (تۆ)و
لەناو دڵی گەورەی خۆیدا
وەك خۆی لەسەر خۆ
دەڵێ:
ئێرە ماڵی دڵنیایی ئێوەیە



# موسافیرێك لە سەفەردایە

(ئەو) موسافیرێكی هێمنەو
لە سەفەرێكدا بۆ سوقاقێك لەبێدەنگی دەگەڕێ
لا دەداتە لای كلاوكوڕەیەكو
پێی دەڵێ: لە فەقیری خۆمو تۆدا
گەورەبوونی تژی لە منالیی دەبینم
لەگەورەبوونی هاوڕێیەتی هەرتكمانا
كەسێك بۆ ئێرە دێو
عەشق بە پاكێتی خۆی دەچێنێ
لە سەفەردا
سلاو لە هەناسەیەكی تەریو دەكاو
پڕ بە حەز كوژەكەی بەر تەویڵی منالێك
ماچ دەكاو چوكلێتێك دەخاتە مشتی
منالێك
منالەكە دەپرسێ: تۆ كێی؟
ئەویش دەڵێ: نەوەی فە قیرترین ئینسان
بۆ كوێ دەڕۆی؟
سەفەرێك تیایدا نهێنیەكانی ژیانم بزانم
بڕۆ ئەی شێت تر لە خۆم

بەلاّم تكایە دەنگ‌و باسی ئەم ڕۆشتنە
بە كەس مەڵێ
مەگەڕێوە ئەی مەكوای ژیان‌و نامۆیی
چۆن لە گەڕانەوەتدا خوایەتیمان دەمرێ‌و
تاڵ تاڵی مووی سپی‌و عاشقانەی چەناگەی باوكم
دەوەرێت
دایكم بەرگەی ئێشی گەڕانەوەت ناگرێ‌و
ئایندەمان پێویستی بە سەفەرە
سەفەر بە جوانی‌و  موسافیرێتی تۆوە
موسافیرێك خەون دەبینێ
سەفەرێك پڕ لە خەون
كە هەر لە خۆی دەچی‌و
وەك خۆی خەون دەبینێ
بە كوێی ئەم كەونەدا گوزەر كەین؟
مەسلەمێوە سەفەرمان جورێكە لە خوایەتی‌و
خوایەتیمان ڕەشنووسێك لە پاكبوونەوە
(ئەو) لە خەونیدا
تاڵێكی مووی سپی كەوتە كەزییەكەی‌و
دایكی هەناسەیەكی خەماوییانەی بۆ هەڵكێشا
باوكی لێی پرسی: لە سەفەردا وەك (ئەو)
پڕ حەز سپی دەچێتەوە؟
سوڵتانێك دێتە ڕێگای
(ئەو) وەك تتری واسكەیەك
لا تلاّسكە دەبەستی‌و
دەڕواو
گۆرانی لە غروبێكدا لە دایك بووم دەچڕێ



دوای گۆرانیەكە ئەم چەند دێڕە دەڵێتەوە
(بڕۆ لە خۆی پرسیار بكە
لە خودی خۆی
لە خوا بپرسە
چەندم خۆش دەوێت)
لە خۆی دەپاڕێتەوە
بێدار نەبیتەوە بۆ ئەوەی خەونەكەت
نەزڕێ
تا پڕ بە شعورت بە نێو ئەم خەونەتدا
شۆڕبێتەوەوە
ئاوێزان بە ڕۆح‌و جەستەی (ئەو) بێت
لە (ئەو)دا
ڕەشماڵێك بۆ تەڕبوونی هەناسەكانی
(خۆ ت)و (ئەو) هەڵدەدەی
لە خەونتا پێیان وتیت:
كوخێك
تەنیا كوخێك بەسە
بۆ ڕۆچوونە نێو حیكایەتەكان

## وەك خۆت

## شەرمن گۆرانی دەچڕێت

چەند شیرینە ئەوگۆرانیەی
هەمیشە لەسەر زارتە
چەند جوانە ئەو ساتانەی
ئارەزووی گوێگرتن لەگورانیەکی
وەك خۆت خومار دەکەی
چەند گەورەیە کە
خۆت و
من و
باوکم و
باوکت و
خواو
فەقیرێتی دایکمان و
سپێتی خۆمان
دەکەیتە پرۆژەی دەقێك و
نوێژ لەبەردەمیدا دەکەی
شەرمنانە چوون ڕوخساری خۆت هاتوویی و
لەهاتنتا
بارانی موحیبەت دەبارێ
٢٠٠٤ _کەلار



## دەفی ئەو عەشقە دڵم ڕادەژەنێ

بەهێوەری بستێ لەخوار ڕیشمەوە،
بیرت نەچێ بستێ بەلای چەپدا.
گوێ لەزیکری دەفی دڵم بگرە بزانە،
هەناسەم بۆنی غوباری سووتانی تەمەنی تۆی لێنایەت؟
ورد ورد،
توێ توێی پارچە شکاوەکانی هەستم بگەڕێ بزانە،
تۆی تیا ون نەبووە؟
هێی کچی دواچۆڕی سەرتەڵێ وەنەوشە،
خودا بۆ هەمیشە نەیتوانی بەسەخاوەتی خۆیمان لەگەڵ بکاو
سیاسەت بۆ هەمیشە نەیتوانی لەمن و تۆ پاکترو
شار بۆ هەمیشە نەیتوانی وەك هەناسەکانی ئێمە بژیو
باخچە بۆ هەمیشە نەیتوانی گوڵ لەرەنگی ئێمە بگری.
تەماشا:
سەرپەنجەی ئەو سازژەنە چۆن خوێنی لێدەچۆڕێ.
تەماشا:
دڵم بوەتە کۆگای ژان و
هەستم بووەتە شوێنگەی واوەیلێ.
تەماشا:
دەفی ئەو عەشقەی دڵم ڕادەژەنێ،
وەك خۆم مورووی ڕازێکی پەنهان بژاردەکا کە،
لێوان لێوە لەسوتانی کەنەفتم.





تکایە بیرت نەچیٚ،
کەهاتی بۆ ماڵی بەشووشەچنراوی ئەم شیعرەی من،
دارلاستیکەکانی مناڵی فڕیٚ دە.
تویٚ تویٚی دڵت وەك خۆی بکەرەوە.
کوژەکەی دیلیٚتی بەر تەویٚڵت فڕیٚ دە.
وەرەو
ئەم لەحزەیە،
لەهیچەوە سەوز دەبین...

٢٠٠٥



## پڕبوون لەئاو

_١_

ورد ورد موتالاٚی دەقی پاڕانەوە لەئاوی کوڕەکەی خەمبار بکە(١)/لەپۆستەرەنامەیەکی خورماڵیدا دواویٚنەی خۆت بدویٚنە/ موتالاٚکە بزانە دواین پارچەی شکاوی شعوری خۆت دەبینیەوە/ گریمان دیٚی بۆ ئیٚرە، لەکەس مەپارِیٚوە تەنها دەستی پاکیٚتی تەمەنی خۆت نەبیٚ/ پرسیاریٚك و دووان و پرسیار بکە، ئەریٚ بیٚ زەحمەت لە بۆشایی نیٚوان ئاسمان و زەویدا بستیٚ زەوی ماوە بۆ پشوو؟ گریمان ئیٚستا من لای تۆم دەپرسم: سوهراب چەند مەن ئاوی پیٚ بوو کە تا دوا هەناسە شیعری پیٚ نووسی و هەر تەواو نەبوو؟ ئیٚستا کەسیٚك دیٚ و لە من دەپرسیٚ لە یاخی بوونتان دەتانەویٚ ریسالە بۆ کام فیرعەون بنیٚرن؟ ئەشیٚ وا نەبیٚ و دوو رۆح تەنیا بە خەیاڵ لە ژەنینی سرووتەکانی رۆحی یەکتر بکرۆژن، پیٚش دەچیٚ لە دوا پلەی یاخی بووندا پڕ بن لە یەکتر/ تەماشا حیکایەتی پڕ بوون لە تۆ لە دوا پلەی بیٚ تۆییدا لەوپەڕی نەبوونەوە دیٚ و دەبیٚتە پارچەیەك لە ئەو/ ئەویٚ کە تۆی لیٚ دەباریٚ و لە دوابازنەی تەنیاتر لە خۆیدا خۆشەویستی قبووڵ دەکا/ ئەویٚك دەفریٚك لە خوار هیٚڵی سفری خۆت واتەنی درەنگ هاتن بووە بە پرسیار...





-٢-

-٣-

سەرت لە نێوان هەردوو ئانیشکت دەربێنە/دووربە هێندەی نزیکی نێوانمان بنوارە چراکە پێکەو بە شارەوی تاریکی نیشتماندا هێڵکارییەکی کورەکەی خەیات(٢) بکە بە دەلیلی هاتن/کە هاتی ووهەور کرێوەی بارانی داکرد بە دیقەتەوە لە بەردەم رۆشنایی چراکەی دەستتدا، لە نهێنی ئەفسونی ورنجەی کرێوەی باران و تیشکی رۆشنایی چراکە بگەرێ/ تۆ وێنەی خۆتت لە ئاوێنەدا دیوە؟ ئەگەر من بووم تکایە بە ورد هەناسەی ئاهی تەنیاییت هەناسەبارانی هاتنەوەم لەوپەڕی تەنیاییەوە بکە/ هاتومەتەوە ئێرەو دەڵێن لێرە شکان ئاسان ئاسایە، تکا دەکەم بشکێم بۆ ئەوەی پارچەیەکم لە ماڵی پڕ لە تەنیایی تۆدا سەوز بێ

-٤-

خۆزیا زانیبام بۆچی هەمیشە
شار پڕە لە باران و
منیش پڕم لە تینیوێتی پڕ بوون لە ئەو

-٥-

مەپرسە من بۆچی کوڕی شەرعی گومانم
چونکە لە نیشتمانی پڕ گومان و
لە وەرزی گوماندا لە دایك بووم
گومانیش گەورەی کردووم و
هەر ئەویش پێی وتم:



لە گوماندا غەرق بە
تا لوتکەی پڕ بوون لە ئەو
هەر گومانیش نەختێ ئومێدی وێدام و
شەجەرەی پشتاو پشتی
بێ تۆیی لێ سەندمەوە
من حەز دەکەم هەمیشە گومان بباریێ
بۆوەی بۆ هەتایە
پاك بینەوە لە یاساغ و حەرام

-٦-

لە دەسنوسی چیرۆکە تەواو نەبووەکەی نێو جانتای نهێنیەکانی سەفەری تەنیایی تەمەنتدا دێڕێك بۆ دیالۆگی قارەمانە نادیارەکەی چیرۆکەکەت زیاد بکە(دێت و وەك پارچەیەك لە رۆحم زاکیرەم لێوانلێو دەکات لە خۆی)..
خودایە شێتێك بێ ئەم دێڕە وەك خۆی
تەفسیر کاو
بیکا بە سەرەتاو
کۆتایی رۆمانێك

-٧-

لێگەڕێ کتومت وەك خۆت
لە کورەکەی بابان(٣) بپارێمەوە
دوا تابلۆی خۆی بۆ حەقایەتی حیکایەتەکانی
پەژموردەیی بوونی تۆ تەرخان کا
لێگەڕێ هەر وەکو خۆت
ببمە ماڵێك
بۆ دوایین هەناسەی پڕ لە ئینسانیت





-٨-

**له یادەوەری منالّیما خواردنەوەی دیشلەمەیەك له سێبەری كەڵەكێكدا بــوو بــە شیعرو له ئێستامدا تۆی لیّ سەوز ئەبیّ/ له سەوز بوونی تۆدا حیكایەتێكی نویّ له دایك ئەبیّ/ بشیّ له ئێستامدا كەڵەكێك هەبیّ له پاڵیا نەخشەی شیعرێك له سەر لێوی تۆ هەڵكۆڵم؟**

-٩-

**له سەر قامكی شەهادەتم**
**یەكەم دێڕی نامەیەكت هەڵكۆڵا**
**كه نوسیبوت: لەوپەڕی نەبوونەوە دێمەوە**
**له تۆ زیاتر دڵم هەرچی تیا بیّ**
**دەیكەمە دەرەوە)**
**وەرە له سەر سەكۆی دڵی ئەم گوندییە دانیشەو**
**لەگەڵ خواردنەوەی عەسرە چایەكی پڕ لوتفدا**
**بەشێكی تر له حەقایەتەكانی تەمەنتم بۆ بخوێنەوە**
**شۆخێكی قەیرە گویّ بۆ تۆ هەڵدەخاو**
**له من دەپرسیّ:**
**ئەرە بیّ زەحمەت مۆڵەتی ناسینی(ئەو)م هەیە**
**مەهدی(٤) له حەوت تەبەقەی غوربەتا بە ئاگادیّ**
**زەنگێك لیّ دەدا**
**-ئەلو..ئەلو**
**پرسیارێكمان هەیە**
**+فەرموو**
**-رەنگی ئاوەسپی كتومت وەك خۆی**
**چوون بلوریەو عاشقانە بۆ ژیان دەڕوانیّ؟**
**-ببورن ئەڵێم ئیلهام(٥) تاقەتی موتاڵای عیشقی ماوە؟**



**تۆش تۆزیّ ڕێتمی دەنگت هێواش ترو نەرمتر دەكەیتەوە**
**ئێتر بیّ ئەوەی ئاگات لیّ بیّ دەڕۆیتەوە بۆ ئەوە سەری تەنیاییو**
**پڕ بە گەروو درەنگ هاتنەوەی دوو خود رادەگەیەنی**
**ئێرە مەملەكەتێكە**
**جیاواز له مەملەكەتەكانی تر**
**لێرە سوتان هەمیشە باڵا دەكاو**
**خۆخواردنەوە بووە بە عادەت**

**٢٠٠٤**

*پەراوێز:*

**١-هێمایە بۆ دێڕە شیعرێكی جەمال غەمبار**
**٢-گەمەیەكی شیعریە له گەل رۆحی كاریكاتێرەكانی ئیسماعیل خەیات**
**٣-كاركردنە له سەر تابلۆیەكی هونەرمەند ئاری بابان**
**٤-مەبەست له مەهدی سالحی شاعیری دوورە ولاّتە**
**٥-سەرچاوەیەكی گەورەی شیعری مەهدی بوو**





# سۆراخ

ئەو، شێتانە توێ توێی سووقاقەکانی ئەم دەڤەرە دەگەڕێو
تۆش درەنگ زۆر درەنگ،
نیگایەك دەنێری؟
ببورە ئازیز....
من هەمیشە چاوەڕوانم....

٢٠٠٤



# لەحزوری(ئەو)دا

لێرەوە پەنجە دەخەمە سەر نەعشی هاتنێك
لێوان لێوە لە
من و
خۆم و
ئەو.
لێرەوە گۆرانی بۆ ئەوی رۆحی من دەڵێم و
بە خۆم دەڵێم:
تەمەنێك لە ڕاڕەوەکانی تەنیایی خۆتدا
هۆگر بە تەنیاییەکانی (ئەو)و
ئێستا ئیتر بووی بە پارچەیەك لە رۆحی ئەو
شەوێك کە پڕ دەبێ لە (ئەو)و
منێك کە لە هاتنەوەی ئەو
لەوپەڕی نەبوونەوە دێمەوە
وەرە بۆ هەمیشە تەماشا
وێنەی منی بە تۆ بوو
وێنەی تۆی بە من بوو
لە لیتاوی مەخسەرەی ئەم مەملەکەتەدا
چۆن لە شەقەی باڵ دەدەن و
لە سوتماکی نەبووندا

هەرزاڵەو شیعر دەچننەوە
لێرەوە نزیك ژوورە شەپڕێوە زێدە ئازیزەکەیو
تێکەڵ بە پاکترین هەناسەی
وەك خۆی سپی
بە هێواشییەك پەنجەرەی رۆحم رادەژەنێو
مژێك لە جگەرەکەت پڕ بە رۆحی تینووم هەڵمژم
ئەوە ئەو بوو
هاتبوو نەختێ بە حوزنەوە بگریو
تۆزێ لە تەنیاییەوە دوور کەوێو
کەمێك گوێ لە پیربوونی ئەم رۆحە هەر بە ناڵیو
هەمیشە هۆگری پەرستنی پاکی بگرێ
ببورە
ئێستا جگەرەکەت کە وەختە نێوان هەردوو قامکی
دوا پەسێوی خۆی داخ دەکات
پێم دەڵێ ئایا دەزانی بێ لە ئەو
کەسێکی تر بۆت ناسوتێ
ئەوە ئەو بوو
جارێکیان شەرمنانە وتی:
باوکم بۆ عەزاب منی خوڵقاندو
دایکم بۆ ئەزبەرکردنی ئەندێشەکانی ژیان
گەورەی کردم
ئەوە ئەو بوو
چیرۆکی سەفەرێکی یاداشت کردو
دواجار وەك قیبلەنوما
نوێژی فەرزی عاشقانەی بۆ دەکردن
ئەو کە هات لە بەیداغەکەی پێغەمبەر سپیترو



لە دەسنوسە چاپنەکراوەکانی قورئانەکەی خواش
نوورانی تر هات
هاتو
وەك سیمفۆنیاکانی بیتهۆڤن بووە پارچەیەك لە شعورم
کە هات دەسنوسەکانی فیراقی نەبوونی سوتان و
موناجاتەکانی عیشقی کردە گەردانەی شیعرو
بە بای باڵی پەپوەسلێمانیەکدا
بۆی ناردم
خۆی وەك بەرەژانی هەناسەیەکی گریاو
بە دواین تەهارەتەکانی گریانمی وت
ئیتر من وەك تۆ دەبم و
سەرمەدیانە دەتگرمە باوەش
بڕوانە بۆ هەمیشە تەماشا
بینایيم پڕ لە ئارام گرتنی تۆ
ئەمشەو ساتێك بەتەنیشت بێداریو
مشوارێك لە حوزنی خەوندا
تۆم دیت شەهادەت لە سەر تەنیایی هەردووکمان دەدا
ئا تۆ بووی
وتت بریا لێرە باییو
بۆ ئەووەڵین ماچبارانی رۆحی گەرمتم کردبا
ئا تۆ بوی
وتت: لە نێوان خەون و بێداریدا
دەتخەمە سەر ئاهی هەناسەی سینەم و
دەتبەم
دوور دوور
لە خاکستانی تەنیاییدا

پڕت دەکەم لە خۆم
ئیزن فەرموو تەنیا تۆ بووی
لە درزەکانی شووشەی پەنجەرەی دڵمەوە
دانە دانە شیعرەکانت هێنایە دەرو
لە حزوریاندا
مەحزونانە نوێژت دەکرد
نوێژێك کە منی لێ دەڕژا
تەنیا تەنیاییەکانی ڕۆحی تۆ بوو
هەناسەی پڕ لە بۆکروزی گرتمە باوەش و
وتی:
مەگری کەسێك لێرەیەو
تا دوا چۆڕ تێر نایێت لە بیناییت

٢٠٠٤/٩/٣

ئەم شیعرە لەڕۆژنامەی ڕیگای کوردستان بڵاوبوەتەوە



## بیرت نەچێ

ئەگەر ڕۆژێ عەشق باری
بیرت نەچێ
لە نامەیەکدا بۆم بنوسە
پڕ بە ڕۆحم خۆشم ئەوێی
ئەگەر ڕۆژێ شکان باری
بیرت نەچێ
ڕۆحت نەشکێ
بۆوەی تەنیاییم نەشکێ
ئەگەر ڕۆژێ تەنیایی باری
پرسیار مەکە
ئەوە منم هاتووم بە سەر پرچی تۆدا
دەبارێم و
لە شوێن ماچێکی نێو لەپتا
عاشقانە چرۆ دەکەم
ئەگەر ڕۆژێ سۆز باری
مەسڵەمێوە ئەوە تۆی
تژی بووی لە من و
وەك خۆت سپی
وەك من مناڵ

ڕۆحی یەکترمان دەشووشت
ئەگەر ڕۆژێ سێو بباریێ
بۆ یەك لەحزەش بێت دەبم بە تۆ
ئەگەر نەباریێ
پڕ بە ڕۆحم بیرت دەکەم
بیرت نەچێ

٢٠٠٥



## بەرائەتەکانی منالێو پیربونی گەورەبوون....

_١_

لەبازنەی شکاوی منالێمەوە دێمەوە، بەسەر پشتی قەیاغێکەوە قەیناغەکانی سەرپەنجەی پڕن لەدڕك و سەفەری پڕ لەعیشق، گوێت لێمە پڕ بەگۆرانییەکانی ڕۆحم بانگی بەرائەتەکانی منالێم دەکەم، من گوێم لەنالێنی ڕۆحمە، تۆ گوێت لەهەوەڵین جاری هاتنەوەمە لەوپەڕی پرزۆڵ پرزۆڵ بوونمەوە، بیرت دێ بەڕێکەوت خوامان دیتەوەو تۆ پرسیاری لەخوای خۆت و منیش پرسیارم لەخوای خۆم دەکرد، بلێ بزانە جوانتر لەم ساتە چییە؟ من تکا دەکەم بۆ ساتێك چاوت داخەی، تەماشا هەستم وەك پارچەیەك لەتۆ بێپەروا دەسووتێ، تۆ نەدیوتەو نەش دەیناسی داپیرم وەك(ئاو) پاك بوو، باپیریشم وەك حەکیمێکی تژی لەحیکمەت نوری لێدەباری و دوو هەست بوون هاوشانی ئەستێرەی سیوەیل، ئەوان هەمیشە هۆگری منالێم بوون، ئەگەر نەمردبان من نەگەورە دەبووم و نەش پیر، داپیرم مرۆڤێك بوو تەنیا لەخۆی دەچوو، باپیریشم هەموو ئەدگارو خۆشەویستی (مەسیحی) لەخۆیدا ئاودێر کرد بوو، بۆ ناپرسی بۆچی مردن؟ ئەوان بەهەست نەمردوون، لەپیربوونما بارانی خۆشەویستی و لەتینوێتیمدا کانییەکی تەقیوی بەهارەو لەتەنیایی ئێستامدا هاتنەوەی تۆن لەوپەڕی





نەبوونەوە، تۆ تەماشا پرچی خەنەیی منـاڵیم ئارەزوەکـانی ئـەوانی لیـدەڕژێو یەکەمین تاڵی سپی مووی چەناگەم تەمەنی سپی تۆی لاَ سەوز دەبێ، ببـووره هەر ئێستا تاڵی دووەمی سپی ڕوخسەتی خواست ماڵێ لەنێو مـووی چەناگـەم چێ کا، کە لێم پرسی وتی: پێـش چـەن چرکەیـەك لـەوێ لەتـەنیایی (ئـەو) ڕووخسەتم خواستو هاتم، (ئەو) وتی: ئـەوێ دوامـاڵی ژەنینـی سـرووتەکانی تەنیایی هەستی منە، بڕۆ بـۆ ئـەوێ هـاڵو هـەواڵی بێقەرارییـەکانی تـەنیایی هەستی منی پێبڵـێ، پێـی بڵـێ: ئەمشـەو گۆرانییـەکی سـەبوور بـۆ شـۆفێری قەیاغەکە بڵێ تادوا سەوڵی گەیشتنە ئێرە، من دەزانم گۆرانییەکانی(ئەو) منی لێدەڕژێ، بیرت نەچێ پێی بڵـێ: بەقـەد بـالاَی هەسـتم خۆشـم دەوێ، (ئـەو) پارچەیەکە *نا* هەستی بێداری منـەو وەك چـاوە خومارییـەکانی خۆیـیو خـۆم خۆشم دەوێ، تکایە بەنێو تاریکی شەودا بڕۆ، تادوا ئەستێرەی بیدارکردنـەوەی خۆربینین، پێی بڵێن: ئەگـــەر ئەسـتێرەی کـاروان کـوژە ویسـتی بێـت، داوای لێبوردن بکا چوون ئەستێرەی سیوەیل هێشتا لەکۆچی هەمیشەییەو نەگەیشتوەتە مەنزەڵ.

_٢_

بیرت دەکەم
بیرت دێ
بیرت نەچێ
کەپێم وتی
پڕ بە هەستم
خۆشم ئەوێی

_٣_

ئەگەر تەمەن بواری دای ساتێك تەنیاتر لەخۆتو تۆ، لە منو خۆم هەستی سپیو بێ گوناهمان بخەرە سەر پشی ئەسپی کحێلی تەنیایی هەرتکمانو بڕۆ ئەزانی



لە کوێ لەنگەر بگرە؟ لە دوا پەناگەی شینایی ئاسمـــان، بـیرت نـەچێ پێشـتر جگەرەیەك بۆ منو جگەرەیەك بۆ خۆت بە گڕی هەستمان پـێ بکـە، لـە نێـو تارمایی دوکەڵی جگەرەکانماندا مـن پۆرترێـتی دەموچـاوی مـەحزوونی تـۆو تۆش پۆرترێتی دەموچـاوی ژاکـاوی مـن دەکێشـی، خوامـان نـاوێ، خۆمـان دەبین بە خوای یەکتر، پرسگەمان ناوێ، خۆمان دەبین بە پرسـگە، ماچمـان ناوێ، خۆمان دەبین بە ماچ، چرامان نـاوێ، خۆمـان چرایـن، خـۆمو خـۆت هەموو شتێکی جوانیین، پرسیاریش ناکەین، چون خۆمان دەبین بـە پرسـیارو پڕ بـە گـەروشمان گۆرانییـەکی(ئـەیوب): (بـیرت دەکـەم/ بـیرم دەکـەی) دەڵێینەوەو پڕ بە ئاهی هەناسەمان پیاسە دەکەین.

-٤-

ئێستا دوا جگەرەی ناو پاکەتەکەم دەردێنمو بە گڕی هەستی تۆ پێـی دەکـەم، بەدەم دێڕێکەوە خەو دەمباتەوە، سوتووی جگەرەکەم دەکەوێتـە بـەر دەسـتم، بپرسە: چی بێدارم دەکاتەوە، خۆر یان خۆم؟ (ئەو) بە هێمنییەك کتومـت وەك خۆی دێو لە تەنیشتمەوە دادەنیشێو ئەڵێ: (باپیرو داپیرت کێ بـوو؟) منیـش دەڵێم: خۆیان بوون وەك تۆ هەستیان پاکی لێ دەباری (ئـەو دەڵـێ: ئـەکرێ مژێك لە جگەرەکـەی دەسـتت بـدەمو لـە فلتـەری جگەرەکەتـەوە بۆنـی دوا هەناسەی خومار...خومار، چون خۆتو خۆم ببینم)؛ من بە جەستە خـــەوتوومو بە هەستیش بێدار، ئەو دەڵێ: (خەونم دیوە، حەقیقەت وەك تەنهایی خۆم، تۆو خوا، تاڵـە)؛ پشـیلەیەك لـە پاینمانـەوە بەخیلانـە سمێـڵ بـادەدا، شـارێك لـە دەرەوەی بازنەی منو تۆ، بووە بە قومارخانەی عیشق، من لەسەر لێوت دێڕێك دەنووسم(هەستی خۆم ورد ورد پشکنی، لە تۆ زیـاتر کەسـم نەدیتـەوە)؛ تـۆش لەسەر خەونێم دەنووسی (پریاسکەی هەستم دوایین مەزارگای هاتنەوەتە)؛ من بەردێك لە تاریکی دەگرم، تۆش دەڵێـی: ( لەبـەرد فـەقیرتر کێیـە؟)، منیـش دەڵێـم: ( مـن و تـۆ)، هـەرتکمان خـەو دەمانباتـەوەو ئیـتر چـــاوەڕوانی دوا





ئەستێرەی بەر لە کازێوە دەکەین بێتوو، لـە نـووری خۆیـدا وەك لۆیـەك بـەفر پاكمان كاتەوە.

-٥-

بڵێ: بزانە بیرت ماوە؟

-٦-

ئەڵێم: خۆشەویستی ئەوەندە سەلارو شیرینە؟

-٧-

ببوورە، بۆچی گۆرانییەکانت، هەمیشە وەنەوشەیی پرشەی دێ؟

-٨-

ئەڵێم، تۆ ئەزانی شێتی جۆرێکە لە عاقڵی؟

-٩-

تۆ ئێستا بای ڕەوینەوەی خوماریيەكانی ڕوخسارمیو
بریا زانیبام لە کوێوە هاتی؟
تەماشا، داپیرم پێش سەدەیەك وای وت:
گەورەبە، ئینسانە شیرینەکەی داپیرە،
دڵنیام تۆ دەبیتە وارسی هەناسەیەکی تەنیاو
ئەویش دەبێتە پەناگەی هەناسەیەکی بێ پەنا
داپیرم وتی: گەورەبەو پڕ بە لە خۆشەویستی
بە گەورەیی خۆشەویستی مناڵ دەبیتەوە،
مناڵ وەك مناڵی ئەوو خۆت



وەرە دانیشە گوێ بگرە،
چونکە داپیرم خۆی ئاشق بوو،
بۆ عیشق گەورەی کردم،
چونکە باپرم نوێگەر بوو،
دەیویست بۆ نوێژ گەورەم بکا،
بەڵام ئەزانی هەردووکیان ڕاستگۆ بوون؟
ئەوەتا من هەم ئاشقم‌و
هەم نوێژگەری ئەشقم،
سا خودایا، بارانێکی بە خووڕ بباریێ، بۆ ئەوەی
من و ئەو
ئەم ئەشقی لە حزوردا بۆ هەتایەو دواساتەکانی
تەمەن،
پاك وەك ئاوێنەی هەستی‌من گەورە بکەی.

-١٠-

من هەمیشە گوێم لە خورپەی دڵی تۆیە،
تۆ ئاگات لە سووتانی هەستی من بووە؟
تۆ هەمیشە گوێت لە خورپەی دڵی منە،
من ئاگام لە سووتانی هەستی تۆ بووە؟

-١١-

من حەز دەکەم لە مووی سپی چەناگەی خۆمت
بدەمێ،
ئەزانی بۆ؟
تا پێکەوە بمرین و سەرمەدیانە ببین
بە یەك.





-١٢-

بیرت نە چیّ ئازیز

-١٣-

-١٤-

پڕم کە لە خۆت
ئەی تەنیایی شەوە نابالّقەکان
هەلّمژێنە لە هەستت ئەی پاکترین تەمەنی یادەوەریم

-١٥-

چاوت داخە،
نەختیّ بارە،
تۆزیّ لەسەرخۆ،
نێو لەپت بخەرە سەر دلّم،
کەمێك تەماشا،
چەند جوانە
ئەوە هەردووکمانین کە فێری فڕینی
ئاشقانە بووین

٢٠٠٤/٩/٩



# کاتیّ هەناسەم دەکوژریّ...

## ئەو هەولاّنەی دەکریّ بێ شیعر

### شلّەژان

..........
دانە دانە
بەنیشتمان ڕانەگەیمان
پێی بلّێین
لەکاتی شلّەژاندا
هێوەرمان کەوە

### بزربوون

..........
ئەوساو ئێستاش
کەسێك دوای بزربوونمان
دوادەنگوباسی





ژمارەی کوشتارگاو
ڕێژەی کوشتارەکانی
بۆ نەهێناین

## جیابوونەوە

.............

دەڕۆم و
بەسەرتەرانژگە بەردا
خێرا خێرا
هەنگاو دەنێم
بشێ پێنەزانم و
بۆهەتایە
زوخاوی تەرەبوون بنۆشم

## بەغدادو تۆ

..............

لە بەغدادەوە
لەو شوێنەی دیجلەی ناوەو
لە پەنای ئەو ڕووبارەی، تەنیا ئەو
بۆ من و ئێوەو ئەنفال و هەڵەبجە نەگریا

## مۆژگان

...........

مۆژگانی ڕۆحم وەك دواتەڕایی فرمێسکی ڕۆحی



پەراش پەراش بووەو
هەڵدەوەرێو
لە دوای سیپەی تەنیایی خۆیدا
گۆرانی بۆ هەوەڵین ماچی تۆ بۆ خوێناوی ترین پەنجەی من و
هەوەڵین ماچی من بۆ پاکترین پەنجەی تۆ

## تاڵێك

........

لە نێوان خەون و بێداریدا،
یەکەمین ساتی یەکترناسین و
یەکەمین نامەی پڕ لە خۆت و
یەکەمین ئاهی هەناسەی سووتاوی تۆو
شوێنی یەکەمین ماچی هەناری تۆم
بینیەوە
کاسەی سەرم تۆی لێدەڕژاو
چی هەڵەتێك بووە
کە پیایدا سەرکەوتم و
چ ڕێگایەکی حەنین بوو،
بەرەو ئێرە هاتی

## خوود

.........

بە خۆم دەڵێم
خودت ئەم هەموو ئێشە چۆن هەڵدەگرێ ؟





## ژان

.......

ئەگەر

ئێرە مەکۆی ژانە

تۆ چ دەکەی لێرە

## سەفەر

........

لەوە ناچێ

ئەم سەفەرەت

پاداشتی هەناسەی تەریوت بداتەوە

## ماچ

.......

حەیف کە نەمتوانی

سوپاسبارانی ماچی یەکتر بکەین

## نهێنی

.......

نهێنیتر لە خۆشەویستی

ترس بوو لە جیابوونەوە



## نوشتە

......

توانای هەڵگرتنی نوشتەیەکم نییە

لێوانلێو بێ

لە ناوی نەناسراو

## جوانی

........

بیرت دێ

هەموو جارێ دەتوت

کەسێ هەیە جوان بێ

وەك سەمای بارانی بەر گڵۆپەکان

## ترێ

........

وەك ترێ

تامی لێوت دەمژم

وەك تامی لێوت

سەما بۆ عیشق دەکەم

## پەنجە

........

برینی پەنجەکانم تیمار کە
تا لە دوور کەوتنەوەت
ئاوازی تەنیاییم بژەنم

## ئێوارە

.......

کە ئێواران خۆر دەنیشێ
پەنجەرەی دڵت دامەخە
بۆ ئەوەی گوێت لە ئازاری هەستی من نەبێ

## شکان

.......

کە هەستم دەشکێ
شەجەرەی پشتاو پشتی تۆی
لێ دەڕژێ

## زریان

......

زریان کە دێ
بێ پرس خۆی دەکا بە ماڵی نەستماو
بێڕەحمانە دەمشێلێ



## قالۆنچە

..........

لە من خۆشحاڵتر ئەو بوو
چون بە وردی بۆ ژیان دەگەڕا

## گۆچان

........

گۆچانەکەی دەستت دانێ
چون پیربوون شەرمی پێناوێ

## بەرد

....

بەرد زۆر فەقیرە
تکایە بۆ هەمیشە
بەرد مەگرە کەس

## کاڵەك

.......

لە توێکڵی کاڵەکێك
حەرفەکانی ناوی تۆ هەڵدەکۆڵم
ئەرێ بشێ پەشیمان نەبمەوە

## بەفر

.......

ساڵی یەکجار لە گوندەکەی ئێمەدا
بەفر دەبارێ
خودایە ئەم ساڵ
بەفربارین نزیك کەیتەوە
تا تینوێتیمان بە ئاو بشکێ

## دەف

.......

سۆزی دەفێك دێتە گوێم
گشت مەخلوقی هێناوەتە گریان
تا ئەو دەگاتە ئێرە
من لە شعوری خۆم دەکرۆژم

## ئاو

.......

لە ماڵی ئاودا
هەموو شتێ جوانە
وردە زیخ
لم
ماسی
شەپۆل
وێنەی خۆت



ورینجەی دوای تاوە باران
درەنگە کەی دەچی لە ماڵی ئاودا
ئولفەت بە نهێنیەوە دەگریت

## نامە

.....

لە نامەیەکدا وای نووسی
لە هەمووتان بێزارم
هەمووتان یەك جووت پێو
یەك ژمارەی پێڵاو لە پێ دەکەن

## هەناسە

........

بە هەناسەیەکی وای وت
بەسە
ئەم هەموو هەڵکشان و
داکشان و
سووتان و
بەسەبەس

## بوختان

.......

لە گریان زیاتر شکم نەبرد
تکایە بوختانم بۆ مەکەن

## کانی

......

بە کانیەکەی پایین گلێنەی چاوی وت

نازانم بۆچ

تێر نابم لە تامی تۆو

تێر نابی لە تەئەسوف

## پەڕەسێلکە

........

دڵی خۆی دایە دەست پەڕەسێلکەیەک و

پێی وت

دنیا زۆر بێ ئابڕووە

با ئامانەت بێ لای تۆ

دەترسێم لێم بترسێ

## بێدەنگی

..........

بە بەردێکی وت

فێری بێدەنگیی و

دڵگەورەیی خۆتم بکە

شەجەرەی پشتاو پشتی خۆتم پێ بناسێنە

ئیدی من وەک تۆ دەبم



## دزی

.......

بە دزیی نەنکیەوە

بە کەڵەبابەکەی وت

واز لە قوقاندنی پێش کازێوە بێنە

با ئەم تەقلیدی ژیانە تێک بشکێ

## زەحمەت

............

قالۆنچەکەی

بۆ سەر سفرەی پڕ لە هیچی خۆی

بانگێشت کرد

بە شەرمەوە پێی وت

زەحمەت بخۆ

سبەینێ و بە هەمان مەبەست

تەشریف بێنە بۆ ئێرە

## شێتبوون

..............

بە مریشکە کڕکەوتوەکەی

ماڵی خۆیانی وت

شێت بووم لە فەقیری تۆ

ئەم هەموو ماندو بوونە بۆ کێ

## دراوسێ

...........

به دراوسێکەیانی وت
تکایه ئیدی
نامەوێ بتبینمەوە

## ئاژەن

.........

بەئەو دەڵێم
دەرزی ئاژەنی ڕۆحم که
تادەبم بەتۆو
لەمندا دەتوێیتەوەو
سەرەنجام
دەبینەوە بەیەك

## ڕەژوو

............

پڕ بەحەز
لەبوونی بەڕەژوو بووم تەماشا
فریادێك شك نابەم
لەم تەنگەوەرییه قوتارم کا



## شکان

..........

لەشکانا
بەرەگەز دەچینەوە
سەر شەجەرەی شووشه

## ئاوێنه

............

لەدیالۆگی نێوان
من و ئاوێنەدا
خۆم و خودم
سەرلەبەری پێوەندی نێوان
من و نیشتمان
دەر ناکەن

## ترس

........

ترسم لەوەیه
ئەم خووەم بمکا به ڕەژوو

## بۆ

.......

هیچ خواوەندێك

لێی نەپرسیمەوە
ئەم هەموو گریانەت بۆ

## ماڵئاوا

........
لەگشت مەخلوق بێوەفاتر بووی
ئەوساو ئێستاش نەتوت ماڵ ئاوا
لەماچە پرتەقاڵیەکانت

## خەونەکان

...........
هەرچیم کرد
نەمتوانی
ماستەرنامەی ساڵی
پەشیمان بوونەوەی خەونەکان
تەواوکەم

## تۆ

.........
هەراشتر لەتۆ
تەمەنی بەخەسارچووی من بوو



## شەوێك

..............
شەوێك بێپیاسەو
بێجوانی
لەبوونی خۆم
لەنەخشەی ئەم کەونە بێزارم

## بێدادی

..........
سەرم لەبێدادی خۆما
چوون بەفر سپی دەچێتەوە

## مەعزەرەت

..............
فریانەکەوتم
مەعزەرەت لەدایکم بخوازم

## خاڵی

........
حەزم دەکرد
خاڵی بمەوە لەگشت بڤەکان

## زوڵێخا

..........

بەڕێی کاکێشانی ئاسمانا
گوزەرم کرد
یوسفم بینی ڕێگای لێ وێڵ بوو
زوڵێخاش بەدوایدا دەگەڕا

## لم

....

ڕێم کەوتە بیابانێك لەلم
مناڵێکی ڕەنگ خۆڵین ڕێی پێگرتم
وتی: ڕێی گەڕانەوەتم پێشاندە

## نەپەرژا

............

هێند بەپەلە ڕۆیی
نەپەرژا بڵێ
ئیتر یەکتر نابینینەوە

## گومان

.........

تەنگتر لەپێڵاوەکانی پێمان





نیشتمان بوو

## گاڵتە

.........

تاهەنووکەش بەگومانم
ئاسمان شکاو
من لێی کەوتوومەتە خوارێ
یان
من شکام و ئاسمان گاڵتە
بەبوونم دەکا

## شەڕ

.........

شەڕ لەخەونێکی شرین
ڕایچەڵەکاندم و
نەیهێشت قومێ ئاوی پاك بخۆمەوە

## سڵاو

.........

سڵاو لەتۆ مناڵیم
ببوورە
نەمتوانی بگەڕێمەوە لات

## درۆزن

.............

جیهان درۆزنە
بەداخەوە فریوی دام

## ژیان

.........

سوونەتی ژیان وابوو
یان
من خەڵەفاو بووم
ك..........
دەبێ ....

..............

## کەشەو دادێ

.........................

پرچی زیونی خۆر قووت دەداو
من دەباتە نێو باوشی خۆی
بۆ یەك چرکە
ئەوسا دەمکا بەدوا منالّی شەرعی خۆی
ئیتر منیش دەبم بەئەو
ئەویش دەبێ بەمن



## بووم بەتۆ

...........

بۆ یەکەمین لەشەوێکدا
بووی بەمن
بووم بەتۆ

## بۆ هیچیتر

................

خەونم دیبوو
داپیرم پێی وتبووم
وریابە بێ لەعیشق
بۆ هیچی تر
نەسوتێی
دوێنێ شەو لەخەوما
هاوڕێی هەناسەی کەسێك بووم
تەنیا لەتۆ دەچوو
ئا... هەر خۆت بووی
پرت کرد بووم
لەحەنینی

## دێم

........

ئێستا ویستم مێژووی مووناجاتێك
بنوسمەوە

وەلیٚ لەپڕێکا نوری خوا هات و
وتی: ئیتر پاڕانەوە کۆتایی دێ و
لەنوری خوا عاشقانەتر دێم و
وەک دواین پێکی بادەم دەتخۆمەوە

## کوپێک چای

.................

دەفتەرو قەڵەمەکەی ئامادە کرد بوو
کوپێک چای ڕەش و
جگەرەیەکی لەنێو پاکەتەکەی دەرهێنا
ویستی حیکاتێك بکا بە چیرۆك
زەنگی تیلفۆنەکە لێی داو
ڕیسالەیەك لەخواوە هات
نووسرا بوو:
تەنها نوێژ بۆ_ئەو_و
خۆت بکە

## شێتانە

........

ئەو شێتانە چوو بووە سەر ڕێی
ئەستێرەی سیوەیل و
پێی وت بوو:
تۆزیٚ لەنووری خۆتم وێدە



بۆ وەی وەك تۆ جوان بم
تۆ نازانی
خۆت ئەستێرەی سیوەیلی و
ئەو لە تۆ ڕووخسەتی پاکبوونەوە
دەخوازیٚ؟

## تۆش

...........

هەمیشە هۆگری تەنیاتر
لەتەنیایی خۆی بوو
بەڵام دواجار خۆی وتی
ئێستا ئیتر من تەنیا نیم و
تۆش جوانترین هاوڕێت هەیە

## تەواو

........

تەواو هەستی بەشڵەژانی رۆحی کرد بوو
کە لە درزی پەنجەرەی ژوورەکەیەوە
دەنگێك هات و
لە سەر هەڵمی شوشەی شعوری
تارمایی خوا دەرکەوت
هێور بوویەوەو
وتی: حەقیقەت چەند تاڵە

## عشق ناسی

............

سەری خستبووە نێوان هەردوو ئانیشکی
خەیاڵ چوون خۆی برد بوویەوە
قەڵەمەکە لەنێوان هەردوو پەنجەیدا بوو
دوایی تۆزێ بێدار بوویەوە
بازنەیەکی دروست کردو
تیایدا نووسی
عشق ناسی

## خوا

......

ئەو ئارەزووی بوو
خوا وەك گەورەیی خۆی ببینێ
کە خوا هات بۆ لای
فەرمووی درەنگ هاتی
وەرە دانیشە/ سەیر
روحم چۆن دەسوتێ

## پەنجەی خوا

...............

بۆ یەکەمین جار
ئارەزوویەکی هاتەدی
سەرپەنجەی خوایی ماچ کردو



تا ئەودیو سنورەکانی جەستە
لێی پاڕایەوە
تێکەڵ بەروحی بێت

## مەگەر

........

ئێستاو لەکاتی نوسینی ئەم دێڕە
مەگەر خۆیو خوای خۆی بزانن
گریان و
پەژموردەیی رۆح چی یە

## هاوڕێ کەی

.............

بە هێشوویەك ترێوە
هاتبووە ماڵی تەنیا هاوڕێکەیو
پێی وتبوو
ئەمانە چاوی رۆحی منن و
بە دیاری بۆ تۆم هێناون
بۆ ئەوەی تینوێتیت بشکێ
تا دواتەڕایی لێوت بیانمژە

## دەیەویست

..........

دەیەویست بزانێ تۆ کێی

بیٚ ئیزنی خواو خۆی
ئاوێنەی رۆحی خۆی شکان
کە بینی لە تویٚ توێی پارچەکانی رۆحیدا
شەجەرەی پشتاوپشتی تۆی لیٚ هەڵکۆڵراوە
پارچەکانی رۆحی کۆکردەوەو
لە نامەیەکدا نووسی
ببورە ئەی جوانترین کەس

## درەنگانێك

........
شەو درەنگانێك
عەزابی رۆحی بێداری کردەوە
لەبەر خۆیەوە ئەمەی نوسی:
چەند شیرینە تاڵیەکانی ژیان
ژیان بیٚ عشق
چ بیٚ مانایە خودایە

## لە پیرێتیا

............
ئەو بە منداڵی پیر بوو بوو
دواجاریش بە پیری عاشق بوو
ئەگەر ئەوی نەدۆزیبایە
لە پیرێتیا
منالٚ نەدەبوویەوە



دەبرۆ لەخۆی پرسیار بکە
بزانە چیت پیٚ دەڵیٚ

تێبینی: ئەم کۆمەڵە هایکۆ شیعرانە لەساڵەکانی ١٩٩٩ _٢٠٠٠ _٢٠٠٢ _٢٠٠٤ _٢٠٠٥ نوســــــراون‌و بەشـــــێکیان لیٚ بڵاوبووەتـــــــەوە... لەرۆژنامـەکاتی(رێگـای کوردسـتان+ رێبـازی ئـازادی+ گۆڤـاری سـورێن) هەروەها دوای بڵاوبوونەوەیان هەندیٚ گۆڕانکارییان بەسەردا هێنراوە.

# شەوارەی ڕۆح

چ بەئاستەم لێدەبوری
ڕۆحت لەشەوارەی شەودا
مشوار  مشوار
بڕواو لەپانتایی قاقڕی تینوێتی دا
عەزرەت بۆ قومێ ئاو هەڵکێشێ
کە دەڕوا
بە نێو ساتە پڕ لە ئەسەفەکانی خۆیدا
جگەرەیەك پێ دەکا
مێژووی تەمەنێك ڕۆدەکاتە بەر پێی
لێیان ورد دەبێتەوە
تاوێ وەستان و
تۆزی هێمنیو
چرکەیەك رامان
دەڕواو نازانێ لە کوێی بێواری رۆحیدا
جێ بۆ پارچەیەك لە دڵی بکاتەوە
ئەو کە تەنیایی هەڵدەبژێرێ
ناتوانێ بۆ تەنیایی رۆحیشی بگری
ئێستا ئیتر بە شەرمەوە لە خۆی دەپرسێ
لە تەنیایی شەوارەی رۆحیدا



دەتەوێ چی بە ماڵی شەو بڵێی
بە خۆت دەڵێی شەو پڕە لە ئولفەت بۆ تەنیاییم
تەنیاییم پڕە لە پرسیار بۆ دیمەنەکانی
سەرێك بۆ تەنیاییت دەلەقێنیو
مژێکی توند لە فلتەری جگەرەکەت دەدەی
جگەرەکەت
یان
تەنیاییت
کامیانت زۆر خۆش دەوێ؟
تەنیاییم بە جگەرەکەمەوەو
جگەرەکەم بە تەنیاییمەوە

٢٠٠٠  دەربەندیخان

_ئەم شیعرە لەکوردستانی نوێ بلاوبوەتەوە

# سەمایی تەنیایی

ژیان هەراشانە نینۆکی شکاندم
بێدادییەکانی ڕۆژ هەر نەبڕایەوە
سنوری بڤەکان وەك هەوەڵین جار وان
پیێ ناچێ نامەکان بگەنە دەستی ئازیزان
شار بارانی لێدەڕژیو
ئێمەش تینوێتی
کەس بەیانی باش ناسەنێتەوە
دەستمان بەجوانیەکان ڕاناگا
کە ژیان چرکەچرکەی حەزم دەکوژێ
هێرشی بۆ دەبەمو
نایگەمێ
ببینە لەدواسیپەی تەنیایی ڕۆحمدا
لۆچەکانی ڕووخساری خۆم
لە لەتێك ئاوێنەدا دەخوێنمەوە
سوپاس بۆ تۆ بێکەسی
ئەرێ نەتدیوە پارچەیەك ئاوێنە
دواحیکایەتی تەنیایی لەخۆ گرتبێ؟
بۆ دواین جار
یەخەی تەنیایی دەگرمو



پێی دەڵێم:
سەما بکە دەی سەما
تا ئەو جێگەیەی تەنیایی هاوڕێیەتیت قبوڵ دەکا
سەما بکە
تا تینوێتیت لەتەنیایی دەشکێ
تۆ ئەی فەقیرترین کەس
نەتزانیوە
بوونت غەشیمانە هاتو
مناڵیت تاسێنراو
گەورەبوونت نەزیفی مەرگو
پیرێتیت گریانێکی بێهودە

٢٠٠١ _زینانە

## مەرگی ئەوی من

ئەگەر مانایەك هەبێ بۆ ژیان
بەخودم دەڵێم: بمرە بۆی تابژیت
بەدایکم دەڵێم:
هەناسەی ئەو لەگەڵ کەزییەکانتا بهۆنەوەو
بۆ هەمیشە شوکرانەبژێری بە
بەساتەوەختی مەرگی ئەو دەڵێم بۆ من بمرە
تا لەتوانەوەی مەرگت بۆم
بەنێو خڕۆکە سورەکانی خوێنتا
باسی تێکشکانەکانی ئەم خودەت بۆ بکەم
تالەهەناسەی تۆی من و منی تۆدا
حەقایەتی نائولفەتیەکانی خوا بگێڕمەوە

٢٠٠٠ _ دەربەندیخان



## بۆنی بارانی غەریبی دەکەم

نەتۆ وەك باران دادەکەیت
تالەگوناهەکانم پاك کەیتەوە
نەش من دەتوانم بتگەیەنمە ئارامترین ماڵ
کەتژی بێ لەکەنارییە باڵ نەکراوەکان
تۆ ناتوانی نەبی بەمن و
منیش ناتوانم وەرزی بێتۆیی قبوڵ کەم
دڵم بینینی ئاوێنەی ڕۆحی تۆ بوو
گشت جوانیەکانی لێ پوکایەوەو
گۆرانیەکانی مناڵیشی تیا مەمنوع کرا
لەنێوان نەغالی و عەکاشەو سەنگەساردا
تەرمی لالە ئەحەمان ناشت و
تەنانەت لەوێشدا
دەنوکی دانە دانەیانیان بڕی
نەتۆ وەك باران دادەکەیت و
نەمنیش وەك هەوەڵین جار
دەتوانم لەباوشت گرم
من کەچاو بەئاوێنەی ڕۆحما ژێرو ژوور دەکەم

تارمایی دەخیلە:
(ئاشووب سەرتان نەخوا)
دەبینم
٢٠٠١ _کەلار



# چاوەڕوانی

بۆ باوکم
ئەی دڵتەنگترین مەخلوقی ئێوارانی پڕ لەنامۆیی،
سەرقاڵی هەڵکۆڵینی چ حەرفێکی لەم وەرزی فیراقەدا؟
ملونکەی کام خەمی گەورە دەهۆنیتەوە؟
بەڕووخساری چ مناڵێکا مناڵی خۆت دەناسیتەوە؟
دەتونی پێم بڵێی،
لەنامۆبوونی ڕەگەزەکانی خۆشنوودیدا،
چ شتیّ...
جوانیەکان دەخاتەوە ماڵی دڵنیایی؟
ئەز بەگوومانم بتوانی بەسەر باڵی چۆلەکەیەکدا،
خوود دڵنیاکەی لەبوون لەنەخشەی ئەم کەونە
بڕۆ....
سەلامەت خۆت ئەی مەکوای ژان
تۆ.....
شك نابەی کەسیّ لەم کەونە دڵنەوایت کاو
کوێرەکانییەك تێراوت کا.
من لەپیربوونی خۆما وێنەی تۆو
بشیّ تۆش لەچاوەڕوانی منا،

نامۆیی خۆت و
هەرتکمان بۆ..................

٢٠٠٠ _ زینانه



# پۆرتریتی شیوەنێک

_١_

لەوەکاشەوە
نامەیەك تیایدا نوسرا بوو:
بۆ خاوەن شکۆی لێوبەبزەی مەملەکەتی گەرمیان
پاش دووعاو سەلام
ئێوە ئێمە نابیننەوە

_٢_

لەئاوەسپیەوە
نامەیەك هات تیایدا نوسرا بوو
بۆ منالێکی بێ باوانی دوای ئەنفال
چاوەڕوانی جیهانێکی درۆزنە وریابە
نەتسوتێنی

_٣_

دەنکە لمێك دوای ئەوەی زۆر لێی پاڕابوونەوە
بە پەلەپڕوزێ خۆی گەیاندە حزووری داپیرەیەك و
وتی:
چرا نەفتینەکە پێکەو بە تەمای دیدار مەبە

_٤_

پیره پیاوێك
به دەم پێچانەوەی سیغارێکەوە
به هاورێکەی تەنیشتی وت:
ئەریٚ برا ئەزانی ئەنفال،
تاعوونی سەردەم بوو
کەس لێی نەپرسیەوە

_٥_

منالێك وا راهاتووە
هەموو چواردەی چواریٚ
تێر تێر بگری و
به دایکی بڵێ:
باوکم،
ناوی چی بوو..؟
باڵای چەندیٚ بوو..؟
بۆ کویٚ چوو..؟
زوو دێتەوە یان درەنگ..؟

_٦_

ئافرەتێك،
سیانزە وەرزی بەهارە..
بیست و شەش جەژنە..
ئاگر لە ماڵی وشکەڕۆیدا
ناکاتەوە..



_٧_

گوندێك
نە پێشوازی لە کەس دەکاو
نەش دەنویٚ...
ئەو لە دیمانەی
ڕۆژنامەیەکی دەم و دەست دۆڕاودا وتی:
به کۆڵەواری تۆی لە خۆم کۆڵەوارتر،
برینی جەستەم قەتماغە نابەستیٚ !

تێبینی/ ئەم شیعرە دوای بڵاوبوونەوەی لە ژمارە(٨٩)ی گۆڤاری سورێندا، ناونیشانەکەی گۆڕاوە.

# لەئاسمانی بێزریوەی ئەم بەیانیەدا

ئەم بەیانیە ڕۆحم بدوێنەو
لەمەربەدەکانی ئاستانەی دڵمدا
بۆ هاتنەوەیەکی ترم
چاو بگێڕە
هەناسەیەکم تژی کە لەخۆت و
پۆست بە بای باڵی چۆلەکەیەکدا
نامەیەکی پڕ لە خۆتم بۆ پۆست کە
لێم گەڕێ بۆ ئەوەی پڕ بە خۆم
بتخۆمەوەو دەرگاکانی بەرائەتی تەمەنی خۆمت
بۆ بخەمە سەر پشت
پڕم کە لە خۆت
ئەی پاکترین چرۆکانی خۆشەویستی
بم بە بۆ ئەو شوێنەی کە تیایدا مەرجەکانی عیشق
دەکرێن بە ملوانکەو
بە گەردنی کلاوفشنەیەکدا هەڵدەواسرێن
دەرم چێنە لەم عیبرەت خانەیە
شعورم لە مۆری بقەو حەرام بشۆرەوە
لە ڕێڕەوەکانی هاتنتا هارن هارن
بە سەرما داباری



لە جیاتی شووشە باقەیەك گوڵ
لە سەر دڵم بوەرێنە
شکایەتی هەناسەم بۆ نائاگایی خۆت باس بکە
فرمان بە گۆرانیەکی حەنینی ئەیوبی کوڕی عەلی بکە
تا بۆ یەکەم چرکەی خۆشەویستیو پێکەوەبوونی من و تۆ
بچریکێنێ
تکایە لێم گەڕێ
لە ئاسمانی بێ زریوەی ئەم بەیانیەدا
وەك تەنیایی ئەوو من و تۆو خۆشەویستی ببینە
تەنیاترین دوو حەزی دیار
سەرم بە تەنیایی ئەوو
جەستەم بە تەنیایی من
عیشقم بە تەنیایی خۆت
هەرسێکیان بە چرکەیەکی ئەم دیتنە بسپێرەو
بڵێ بزان کوێوە دەڕۆی
دەتەوێ ئاوازی ئەم تەنیاییەت لە کوێدا بسرەوێ
بمگرە باوەشی پڕ لە حوزنت
ڕێگەم بدە وەك دوایین پێکی مەست بوون
بتخۆمەوە

٢٠٠٣
سلێمانی





# خولْقى تەنگى پاسارييەكان

وا ڕاهاتوين پاسارييەكان بگرن و
باڵيان بكەن، چەقۆى كول بخەينە مليان
پێيان بڵێن: ئێوە لەجوملەى خەمسەى فاسقن،
سلاْولە ئێوە ئەى خولْق تەنگترين گيانەوەرى سەرگۆى زەوى..
خواى گەورە خەتاى كرد كە وەك حيكايەتەكان دەگێڕنەوە فەرموويەتى:
لەناوبردنى ئێوە چ گوناهێك نيە!
سلاْو لەخۆتان من بەخولْق تەنگيتان دەزانم و
لام بووە بە پرسيارێكى هەميشەيى...؟
سلاْو لەئێوە بفەموون لە كەژاوەى ڕۆحمدا،
پرياسكە خەمەكانتان بكەنەوەو
بەرەوە چۆلەكەيەكى ترى تەريويش بڵێن:
تەشريف بێنن بۆ ئێروكانە تا دەمارەكانى خولْقى تەنگتان،
خاوبێتەوەو ئازادانە گۆرانى ماڵى چۆلەكەكان تێك دەين و
حيكايەتى نێو سورەتەكانى قورئان ببەينە ڕجا بۆ لەنێوچوونيان..
ئاى ئەمە چ گوناهێكە دەيكەين ..
ئاى ئەمە چ غەدرێكە دەيكەين..
ئاى ئەمە چ نەريفێكە خۆمان بە خۆمانى دەكەين..
بۆيە ئێستا چۆلەكەيەك كەيفى پێمان نايە..
لەگەڵ فەجرى بەيانياندا ناماندوێنێ..



بە لەبەركردنى كراسە پەمبەييەكانمان،
ئاسودەيى باڵ بەسەريانا ناكێشێ..
وا ڕاهاتووين،
بۆيە بەديتنمان پاسارييەكان خولْقيان تەنگتر دەبێ..
٢٠٠٢/كەلار

# عەزاب

تەمەنێك لە ڕاڕەوەکانی مێژوودا
بە عەزابی برینی ناخمەوە خولامەوە
ڕۆژ بە ئامانەت منی سپاردە شەو
شەویش بە مانگ‌و
مانگیش بە ساڵ
ساڵیش بە چەقۆیەکی کول
پێڕانەگەیشتم بۆ لەحزەیەك
لە (دانا)و (زانا)[1] ماچێکی مزرو
لە دایکم قومێ شیری سپی بخوازم
عەزابێکە ئەم تەمەنە فالە[2]
پڕە لە فیراق‌و
پڕە لە ڕەشبینی‌و
پڕە...پڕ
لە دەسنوسە چاپنەکراوەکانی

---

١مەبەست لە (داناو زانا)ی جگەرگۆشەمە.

٢ هێمایە بە ناوی چیرۆکنوسی هاوڕێم(فایەق ڕەحیم).



ساڵی دزین و
زڕاندنی خەونەکان
٢٠٠٠ ڤێریێ . یۆنان

# هیچ

مەست بوون پڕە لە هیچ لێرە
ئەو کات لە درزی شووشەی ماڵەکانی قەراغ شارەوە
پڕاوپڕ بووم لە عیشق
ئێستا وێرانەیە دڵم
لێم ناگەڕێ خەمی قورسی هەڵاتن
دەنا پارچە پارچەی پەراش بووی ئاوێنەی شعورم
دەئاخێنمە نێو پەشیمانییەکی قورس و
پێتان دەڵێم
من بە ئێشی نیشتمانەوە جوانم

٢٠٠٠ ئەستەنبول/ تورکیا



# شەختەبەندانی ڕۆح

ڕۆح پانتایی برینە
برین مێژووی تیاچوونی ڕۆح
ئێستا من فەقیرترین چۆلەکەم و
بە سامالّی ئاسمانی سەرتا
لە دووی ئەستێرەی بەختی ونبووم دەگەڕێم
نازانم لە دەربەستی ئاستانەی دڵمدا
یان تەرەبوونی خۆشەویستیم
لە ساڵنامەی ساڵە ونبووەکان بگەڕێم
چی کارەساتێکە ماڵی دڵی من
کە تێیدا بێ بایەقوش هیچی دیکە ناخوێنێ
بە هیچ ڕانەپەڕژام
تەنها بە مۆمی بەختم وت:
بسوتێ تا پێکەوە بە خاکدا ڕۆبچین

## شەو داهات

شەو داهات
من و خۆم
ئەوو خۆی
لە یەك دابڕاین
شەو داهات و وتی:
وەرنە ژێر باڵی من
ڕۆژ دەرگای ماڵی خۆی لیٚ قفڵ داین
ساڵ ڕۆژژمێری لنگەو قوچ
بۆ ڕەدکردینەوە
مانگ شوێنگۆڕکێی
بە جێگای ڕاستەقینەی خۆی کرد

٢٠٠٠ سۆفلی/ یۆنان



## سێبەری ژێر ساباتی (با)

کەی بگەڕێینەوە
سەرێك لە ماڵی(با) بدەین
یان لە باوشیا سەرخەوێك بشکێنین
بابڕۆین لەگەڵ ئەودا
پیاسەیەك بە نێو سروتەکانی ژیاندا بکەین
لەگەڵ بادا دەبینە هاوڕێو
نهێنییەکانی ژیان بۆ یەکتر دەگێڕینەوە
بە ئەو دەڵێین
(با) مێژووی سووتانی خەون
بە خوێنی سەرپەنجەی یەکتر بنووسینەوە
بشیٚ (با) هاوڕێیەتیمان قبووڵ بکا
تۆ تەماشای دڵی گەورەی بات کردووە
تۆ قەت دیوتە (با) کەس لە ماڵی خۆی وەدەرنیٚ
ئەو هەندیٚ جار بە توندی دێو
هەندیٚ جاریش ئێجگار لە سەرخۆ
پەنجەرەو دەرگای ماڵەکانمان دەکوتیٚ
لە خولکی گەرمی بادا
بیر دەکەینەوە
خەون دەبینین

لە خەونمانا پاك دەبینەوە لە گوناهی نەکردە
تۆبە دەکەین لەوانەی
زمانمان بە بڤە پێی پژا
تۆ تەنها دەستتم بەریٚ
تۆ تەنها بۆ ساتیٚ چاو لەیەکنیٚو
خەون بە تارمایی پشت پەنجەرەی کابوسەکانەوە ببینە
لە وەرینی  وەرزی گەلاڕێزان بڕوانەو
لە هەڵپڕووکاندنی چرۆی هەناسەکانت تەماشا
بڕۆ ئەوەتا با
چاوەڕوانمان دەکا
بڕۆ ئەوەتا با
بانگمان دەکا
سەیرکە ئەوەتا با
لە هێمنیدا وەك سەبری ئەیوبو
لە تیژیدا وەك فەنەر دیٚ
تەماشاکە دڵی گەورەیە با
ئەوەتا قەیناغەکانی سەر پەنجەی
بۆ من و تۆ بە جیٚ هێلاٚ

٢٠٠٠ دەربەندیخان



# هەناسەکانی بەرد

سڵاو ئەی بەرد سڵاو
ئەویٚ رۆژیٚ دیتمی
بە هاوڕیٚ دێرینەکەی خۆت
خاکت وت
لە سەر گازەرای پشتم بنووسە
کەس دڵگەورەیی منی نەبوو
وەلیٚ بیٚ خانەخویٚ کرام
گویٚ بگرە بەرد
من عاشقی سەبرو دڵگەورەیی تۆ بووم
تۆ بە کانی خاکت وت
بنووسە
بەرد لە هەمووتان
لە کابووسەکانی سەر پشتی
تەواو بێزارە
گویٚ بگرە بەرد
بڕیارم داوە بۆ پشتاوپشتی خۆم
باسی بەرائەتەکانی تۆ بکەم
پەژیوان بوومەوە بەرد

لەو ساتانەی تۆم لە نێو بەردەقانیو
قۆچەقانی دەئاخنیو
دەمکێشای بە هەنگڵی گیانەوەراندا
تۆ چەند گوناه بووی
کە ئێمەی چەقاوەسوو
تۆوی شەڕی گەورەمان پێچاندی
گوناهتر بە دەستی ئێمە دەبویە باعیزی
بڕینی رزقی گەلە چۆلەکەکان
ئێستا ئیتر پەژیوانم لەوەی زانیم
جوانە هەناسەکانی بەرد
هەناسەکانی جوانە بەرد

کەلار/ ٢٠٠١



## ئەو کاتەی کەدەڕژێمە گەرووی مەنفاوە

تۆ کە دەڕۆی سەفەر خێر
کەهاتیەوە
چیمان بۆ دەگێڕییەوە؟
باسی گوڵ
یان کچ
عیشق
یان جوانی
کە ڕۆیشتی وات وت:
من دەڕۆمو کاسەی سەری ماندووم
دەسپێرمە مەنفا
من دەڕۆمو
مەنفا دەکەمە جێپشووی هەناسەی ماندووم
من دەڕۆمو
مەنفا پردەکەم لەگریانو هاوار
من دەڕۆمو
بەسەر چڵی درەختێکەوە دەنیشمەوە
بەپێنوسەکەم

جوانترین هۆنراوەی بەزمانی باو بۆران بۆ دەنوسم
من دەڕۆم و
لەوێندەر دەبمە پاسەوانی باخچەیەك
تاحیکایەتی پڕاو پڕ لەمەئویسی خۆمی بۆ بگێڕمەوە
ئەگەر ئەو لێمی نەپرسی
خۆم دەیدوێنم
ئەگەر ئەو خولکی نەکردم
خۆم دەچمە ژووریّ
ئەگەر وتی: بۆ بێئیزن دێیە ئێرە
دەڵێم عەفوو فەرموو
من کوڕی شەرعی نیشتمانێکی ئیزن دراوم
کەعەیامێکە
جوانترین گەمەو
خۆشترین شەڕو
جوانترین خەیاڵ،
گەورەترین تێکشکان و
تف ........
ئەوەی دوێنیّ باوکی شەرعی بوو
ئەمڕۆ ناپناسیّ
مەرحەبای ناکا
ئەوەی ئەمڕۆ باوکی شەرعیەتی
سبەینیّ دەیخاتە مۆزەخانەی لەبیرچونەوە
دەڵێم عەفوو بفەرموو
بۆ تەنیا شەویّ داڵدەمدە



تاحیکایەتی تیتلەو بیبلەت بۆ بگێڕمەوە
بیری دەخەمەوە
کەهەموو دەرگایەکمان کوتاو
کەس بەپیریمانەوە نەهات
کە ڕۆیشتم گریانی بەرد
لەهەناسەی هەڵقرچاوما
ژیر دەکەمەوە
شاباڵی خوێناویی کۆتری ئاشتی
بەعەتری گیانەعنا دەشۆم و
لەباوشما دەیخەوێنم
کوختیەك دەکەمە هاوڕێی خۆم
کەهەردوو بێچوە سورە قەتەکەی
لەلێزمەی بارانە گوللەی پۆلێك جەلادا
بوون بە قووربانی
لەپایتەختی هەموو ولاٚتێك
ئەو دەکەمە سەفیری خۆم
من و ئەو
هەردوو پێکەوە دەبینە دوو باخچەوانی ڕاستگۆو
یادەوەرییەکانمان لەپەڕەی گوڵ دەنوسینەوە
ئێستا دڵم لەهەناسەم تەنیاترە
بەگومانم لەوەی هەناسەم لەخۆم نامۆتر نەبیّ
ئێستا مرۆڤێکی شێتۆکەم
لەبەردەم دەرگایەکی ئاسنین و
دەرگاوانێکی دڵڕەقدا
تکا دەکەم

بمناسێتەوە بۆوەی بەهاوارمەوە بێ
ئێستا ڕەنگم لەڕەنگی وەرزێڕێکی کەنەفتی
دوای پەنجا ڕۆژی دروێنەی جۆگەڕ دەچێ
بەڵام ئەو وەرزێرە زۆر شادوومانە
بەرهەمی بەفەلاکەتچووی خۆی درویوەتەوە
کەچی من هەمیشە پڕم لەتکاو تەنیایی
کەرۆیشتم
نامەیەك بۆ ئێوە دەنێرمەوە
تیایدا هەموو شتێ دەنووسم/ تەنانەت...نا
کەنامەیەك لای ئێوەوە بگاتە دەستم
دەزانن چاو بۆچی دەگێڕم؟
ئا........
ئافرەتێك لەئاودرێ باراناوێکدا
بەبێ لوت و گوێ تەرمەکەی دۆزرایەوە
شاعیرێك بەزیکری شیعرێکی نوێوە
درایە بەر رێژنەی فیشەك و
ئەمرۆ نایناسێ......
مەرحەبای ناکا......
ئەوەی ئەمرۆ باوکی شەرعیەتی
سبەینێ دەیخاتە مۆزەخانەی لەبیرچوونەوە
دەڵێم عەفوو بفەرموو
بۆ تەنیا شەوێ داڵدەم دە
تا حیکایەتی تیتلەو بیبلەت بۆ بگێڕمەوە
بیری دەخەمەوە



کە هەموو دەرگایەکمان کوتاو
کەس بە پیریمانەوە نەهات
کەرۆیشتم گریانی بەرد لە هەناسەی هەڵقرچاوما
ژیر دەکەمەوە
شاباڵی خوێناوی کۆتری ئاشتی،
بە عەتری گیا نەعنا دەشۆم و لەباوەشما دەیخەوێنم
کۆختییەك دەکەمە هاوڕێی خۆم
کە هەردوو بێچووە سورەقەتەکەی
لەلێزمەی بارانە گوللەی پۆلێك جەلادا،
بوون بە قوربانی
لە پایتەختی هەموو وڵاتێك
ئەو دەکەمە سەفیری خۆم
من و ئەو
هەردوو پێکەوە دەبینە دوو باخچەوانی راستگۆو
منالێك بە چاوەڕوانی ئەو دیارییەی باوکی بۆ راسپارد بوو
پێیان وت:
باوکت چووە ریزی کاروانی نەمرانەوە
خەریکە سیاسییەك لە شاشەی TVیەکەوە وتی:
مێژووی دنیا وایە
خەڵك مۆریلە و
ئێمەش پێی پیا بنەین
مەلایەك لە بڵنگۆی مزگەوتێکەوە جاڕی دا:
ئەم وڵاتە بۆنی غەزەبی لێ دەبارێ
خودایە ئەم نەوەیە ببەیتەوەو

نەوەیەکی ساڵحانمان وێ دەی

من دەڕۆم

لەو سەری نامۆ بوون و پەشیمانیەوە

لە سوقاقی شارێکا

لەگەڵ منالێکی ئەنفالا

دەبمە هاوڕێو

باسی:

قەسیدەی(وەرزە ئاڵەکانی عەدەم)ی غەمبارو

(منالێك لەوێوە هات وای وت)ی دلاوەرو

هەناسەی شاعیری دیوانی (خواو شارە بچکۆلەکەم)ی بۆ دەکەم

کەهاتی‌یەوە چیمان بۆ دەگێڕییەوە؟

فەلسەفە

یان

فیکر

سیاسەت

یان

شیعر کەرۆیشتی وات وت:

سیاسەت تەلاق دەدەم

فیکرو فەلسفەی زل نافرۆشم

شیعر دەبێتە،

دوا ماڵم و لەشووشەی عەترا

بۆتانی دەنێرمەوە

تۆ هەمیشە مرۆڤێکی راراو چی‌و .. ئاخ

بریا ئەوەندە حەزت لەژانەسەرو



کاسەی سەری جەنجاڵ نەکردایە

ئاخر تۆ چیت داوە

ئا خـ ر ت ۆ چـ یت

## نەختێ سڵاو

هیچ کاتێ وەك ئەم بەیانیە
سۆراخی نیوەی دووەمی ڕۆحی نەدەکردو
گوێی بەئازاری دووری نەدابوو
بەچاوی خۆی نێڵەی سوتانی دواهەناسەی ئەوی دیبو
پەیتا پەیتا دەچوە سەرخۆو
لەوکلاوکوڕەیەی دەنواڕی
کەبەمەراقەوە بۆ دزینی بێچووەکانی دەگەڕا
ئاخر ئەو دەزانێ خەنیبوون لەدووری ئەودا
وڕێنەیەکی بەتاڵەو
هاتنەوەش تەنیا خەونێکی وەنەوشەیی
بیرتە هەموو بەیانییەك بەنەختێ سڵاو
کە تژی بوو لەخۆت
دەهاتی
بیرت نەچێ
نزیکە بەنەختێ سڵاوی تر بگەڕێیتەوە

کەلار



## تەناف

تۆ ئەو دەفە بژەنەو
منیش لە حزوورتا خۆم بەو تەنافەدا هەڵدەواسم
کە پێدەچێ لە دوایین پەرەگرافی نووسینێکمدا
دانی پیا بنێم.
من دڵنیام تۆ شارێکی لێوانلێو لە هەناسەی سپی
هەستت لە ئاوێنەی شیعر ناسکترە
وەلێ خەجاڵەت خۆم کە دڵم شکاندیو
ببوورە کە من لە نێو کەڵچەرێکدا گەورە بووم
عاری لێ درژێ
من ئەو دەفە دەژنم و
تۆش لە بەردەمما گۆرانی بۆ موژگانی رۆحم بڵێ
کە پێی وایە بۆ هەمیشە تێر ئاو نابێ
ببوورە خەیاڵێك لە سەرمایە
هودهود دەبێتە ئاوێنەیەك لە تۆ
ئەوەی لە چەندین نامەو شیعردا نووسیمن و وتم:
بۆ برین و خوێن لەبەر چۆڕان و
شکاندنی هەستی کەسێك نەبوو
کە تا نهۆش تژین لە نهێنییەکانی بەرائەتی ئەو
تۆ گوێ لە زیڕەی زنجیری ئەو دەفە بگرە

منیش لەبەر دەستدا بە هێمنی
چیرۆکی هەناسەی برژاوی خۆمت بۆ شی دەکەمەوە
کە وتم ئێرە نیشتیمانی خەزان و
نغرۆبوونی هەموو جوانییەکانە
بگەڕێوە نێو کوخە جەنجاڵییەکەی تەنیاییم و
لەسەرخۆ پێی بڵێ:
بوار بدە بێمە نێو تارمایی هەناسەکانت و
پڕ بەحەزی تەنیاییم
لە باوەشی تەنیایی دوایین نووسن
ئاوێزانت بم.
ببوورە
کەی من وتوومە ئینسانێك هەیە سفڵەو
بێئاگا لە دنیاو ناسکترین وشە سەردەبڕێ
نا..........
ئەوە من نیم و نەتۆیشی
نەزانین نوێژی پاکبوونەوە بۆ جوانترین رستەی نێوانمان بکەین
ببوورە
هاوڕێی بێ کەسیی و تەنیاییم
ئێستا لە زستانی خواروخێچی رۆحما
تۆ نەبێ، کەس ناتوانێ ساتێك ژیرم بکاتەوە
کەس ناتوانێ ببێ بە ساتێك لە من
کەس ناتوانێ لە رۆحما وەك گیانەغا سەوز ببێ
ئەوەی لە شیعرێکما گەیشتووەتە بەر پەنجەرەی ژوورەکەت،
خوڵقی لێوانلێو لە خۆخواردنەوەی مندا
ببینە چەند بێ ئەنواین
چەند بێ مەئواین



چەند بێ زەوق و
بۆ هەمیشە گریانمان لێ دەڕژێ
ئێوارەیەك کە چاوەڕوانی دەمکوشێ
نامەیەك دێ و
جارێك شادمان
جارێك بێزار
زۆرتر لە جارێك
تەنیایی دەمشێلێ
من ئەو دەفە دەژەنم و
تەماشا / گوێ بگرە
ئەرێ بشێ ئەوە من و تۆ نەبین و
سرووتەکانی رۆحی یەکتر بژەنین
ئەرێ بشێ تۆ شەم نەبیت و منیش وەلی؟
تەماشا هەموو ژەنینێك
سرووتێکی گەورەی هەڵگرتووە
هاتنی تۆش
گەورەترین سرووت دەژەنێ
تەماشا
مناڵێك لە باوشدا پاك نوێژی گوناحەکانی خۆی دەکا
چ غەدرێکی گەورەیە
کە نەزانانە بەردم گرتبێتە ئاوێنەی پەنجەرەی ماڵەکەت و
بەدەم هاویشتنی ئەو بەردانەوە
پرزۆڵ پرۆڵ بوویێتی
تەماشا / ببوورە
پەشیمانم لەوەی کە وتبێتم و
تۆی تیا شکابیت

پەشیمانم لەوەی كە وتوومەو
ڕێزەیەك تۆی لێ ڕەنجاندبێتم
پەشینمان لەوەی كە دەوترێ
تۆ هێندەی تر تەنیاتر بكا
تەماشا
لە سپیترین كەس دەپاڕێمەوە
لە سوچێكی دڵی داپەنامدا
بۆ ئەوەی
ببم بە ئەو

٢٠٠٥



## پڕ بە ئەو، ماچی ڕۆحی تەنیایی

ئێستا من تەنیام
تەنیاتر لە خوا، لە خۆم و لە ئەو
لە دوو تۆوی تەنیایی ڕۆحمدا
بیرەوەری سەفەرێك یاداشت دەكەم
كە پڕ لە تەنیایی ڕۆحی ئەو
سەفەرێك دەمكا بە كوڕی شەرعی خۆی و
جارێك لە ئاستانەی(نامۆیی) بووندا
بە ئەدەبەوە پێم دەڵێ
نەبوون وردو خاشكەو
بوون بە وەرزی تەنیاییەكانی ڕۆحەوە
بگەیەنە بە یەكەم ساتی یەكترناسینەكانی هاتنەوە
لە دۆزەخ و بەرائەتەكانی نێو یەكەمین ڕەشنووسی
پڕۆژەی دەقێكی بێ كۆتایی
بگەڕێوە بۆ سەرەتا
بۆ یەكەم چركەی هاتنەوەو
سێبەری یەكەمین تاوی بارانی خۆشەویستی
لەوێ بە بێداری ڕۆحەوە سەرخەوێك بشكێنەو
لێرە ئاوێزان بە ڕۆحی پەشێوی من بە

دەتوانی فەرموو لە نەبوون بکەی بار بکاو
لێرە رۆحم بگریتە باوەش و
تێکەڵ بە ئولفەت و ماچ بکەی
من دەزانم لێرە هەموو شتێك گوناح روخساری داپۆشیووەو
تۆش دەزانی ئایەتێك نیە لە کۆشیا
حەقایەتی حیکایەتییەکانمان تیا شی بکەینەوە
من دەزانم تۆ لە کلاوفشنەیەکی پەڕوباڵ کراو، تەنیاتری و
تۆش دەزانی من فرسەخێك لەودیو بێ کەسییەوە
پەرت پەرت بووم و خۆتیش نەبی کەس ناتوانێ
دڵنەواییم بکا
بە سواری گالێسکەیەك کە پڕە لە تامەزرۆیی دیدار هاتووم
نووسینی نامەیەك کە ئەوی لێ دەرژێ لە خۆیدا دەمخواتەوە
تکایە لێرەدا دابەزین هەیە
دەڕۆم بۆ ئەو بستە جێگایەی کە ئەوی لێدا دادەنشێ
لەگەڵ ئەودا خوایەك بۆ پەرستن لە خۆشەویستی دادەتاشین
دەڕۆین بۆ لای ئاشقێکی نوورانی
بۆ پرسیاری نووسینی نوشتەیەك لە ئاو
لە سەر توێکڵی کاڵەکێك کە یەکەمین من و تۆ
تا دوا شێی تەڕایی لێومان ماچ کردبێ
ئا
نوشتەیەك کە بە ئاو نووسرابێ
تا پێکەنینەکانمان لە شەپۆلەکانیدا بۆ یەکەمین جار ببینین و
گریانمان بۆ هەمیشە لە بیر بچێتەوە
ئا
لەوێ رۆحت ماچ دەکەم تا ببی بە من



رۆحم ماچ بکە تا ببم بە تۆ
دواجاریش لە ئاو دەپاڕێینەوە
نەورەسێك بانگ دەکاو
فێری فڕینمان بکا بۆ شینایی ئاسمان
تا بە کەماڵی ئیسراحەت
لەوێ دانیشین و گۆرانی
بۆ ئایندە بچڕین
کە گەڕاینەوە پەرەسێلکەیەك بانگمان دەکاو دەپرسێ
ئێمە کێین و دەمانەوێ مێژووی ئەم سەفەرەمان
بە حەرفەکانی کام زمان یاداشت بکەین
ئا
بیرت نەچێ
ئافرەتێکی قەیرە تاڵێك لە کەزیەکەی تۆ دەخوازێ و
نوشتەی پاکبوونەوەی لێ دەبەخشێتەوە
مامزێك دێتە رێگەمان و
پرسیاری ساڵی بەفرانبارمان لێ دەکا
قومرییەك دەپرسێ
سەربالّی من یان ئاسمان شین دەڕوانێ؟
کوختییەك شکایەتی بە تالآن بردنی هێلانەکەی دێنێتە لا
کانیلەیەك
سکالآ لەدەست ئەنفال تۆمار دەکا
ئا
ئەو دەڵێ: من هێمنترین جێژوانی ئاشقان بووم و
لەوتاندمیان
وەلێ کەس لێی نەپرسیمەوە

بیرت نەچێ ئیتر من و تۆ
بە رەگەز دەچینەوە سەر شەجەرەی پشتاوپشتی ئاو
لێرەوە دەڕۆین
چۆڵەوانی دەکەین بە ئاوەدانی
مەملەکەتێك وەك ئاوێزان بوونی رۆحی خۆمان چێدەکەین
شیعر دەکەین بە سەفیری خۆمان
پڕاو پڕ نووسینی وشەو دێڕ
خۆشەویستی دەچنینەوە
ببوورە
ئا
تۆ
قەت
پرسیووتە
ماچی من بۆ تەنیای رۆحی تۆو
ماچی تۆ بۆ تەنیایی رۆحی من
لە کام لەوەرزەکانیساڵدا دا دێ؟
وەرە تەماشا
رۆحم لەسەر شەپۆلی هەناسەیەکت کە پڕاو پڕە لە خۆم
چەند تینوو لە ماچبارانی لێوت دەگەڕێ
دڵنیام بیرت ناچێ
بیرت دێ، وتم: بیرت دەکەم؟
ئا
وتت بیرت دەکەم
رۆحم هەمیشە پرسیار لە نیوەی دووهەمی خۆی
کە(ئەو)ە دەکاو بە گومانم لەوەی نەتپرسیبێ



نیوەی دووهەمی رۆحت لە کوێیە
گەر قەدەر پێش مەرگی خستین
لەوی رۆحت بپرسە
دنیا چ عەزابێکە بۆ تەنیاییمان
وەرە دانیشە تەماشا
٢٠٠٤

# ئەسیاری هەناسەیەکی گریاو

ئەم بەبانییەش،
دوا رکاتی نوێژی دوایین ساتی چاوەڕوانیت کۆتایی پێ بێنە.
بڕۆرەوە بۆ ئەودیو بوون،
لە خولقی تەنگی خۆتا، بچۆ بۆ دیداری ئەو بەهەشتەی،
کە نەدیوتەو نە دەیناسی،
ڕێ بە بانگی سوبحەینانی سۆفییەکی نوورانیی‌و بێ ئاگا لە دونیا بگرە،
پێی بڵێ بزانە، من‌و ئەو بە کام شەجەرە، دەچینەوە سەر پشتی یەکتر!
لە کاوێژی سیاسییەکی خەسیو مەسڵەمێوە،
نەکەی کڵاوکوڕەیەك لە خەو رابێنی‌و ترپەی دەنگی ژێر پێت،
کوختییەك لە ئاو بکات.
مەگەڕێوە بۆ بیرکردنەوە لە پەیوەندی نێوان خۆت‌و خوا،
چون خوایەتی بێجگە پاکێتییەکی بەتاڵ، بوونێکی نییە.
ئەگەر خاچێکت دی لە سێدارە درا بوو،
ئەوە خۆتی مەسیح نییە.
ئەگەر سەگێگ لە دوورڕا، دەوەڕی،
ئەوە بە عەشق دەوەڕێ.
ئەگەر تەنیاییت دی هاواری لێ هەستا بوو،
ئەوە لەگەل پرسەگێڕی خۆیدا، شەڕێتی،
تکایە هۆگری بە.



قومێك ئاو لە مەتارەکەی دەستی من بخۆرەوە،
من کوڕی پیاوێکی نوورانی خوانەپەرستم،
ئەی کچی بێدەنگترین پیاوی تەنیاتر لە خوا، لە من‌و لە خۆت.
ئەگەر حیکایەتی خۆراسانت[١] کەوتە بەر گوێ،
پرسیاری زەریف[٢] بکە،
کەس لە ئەو راستگۆتر، ئەم چیرۆکەت بۆ ناگێڕێتەوە
ئەگەر جەمیلەت[٣] بە چاوی خۆت بینی، دەگری،
تەنیا کوڕەکەی دەروێش عیسا[٤]، بدۆزەوە(ئەو) نەبێ،
کەس نازانێ نهێنی فرمێسکی گریان چییە.
ئەگەر دەتەوێ لە گێژەنەی ئەم باهۆزی تەمەنەو
ئەم هاتنی بە لێشاوی وەرزی وەرینە، رزگارت بێ،
لەدایکم پرسیار بکە،
بزانە من کوڕی بام یان باران، یاخود سوتان.
ئەی بۆ لە خۆت ناپرسی، تۆ کچی وەنەوشەیت،
یان تۆفان، یاخود ئافاتی ساڵی عیشق؟
کە گەشتییە بەر دەروازەی شارو یەکەمین پەنجەرەی شکاوت دی،
ئەوە منداڵەکانی ئیبلیس بوون، بە فیتی سەرۆك‌و
خێڵ،
ئاین‌و
ناموس
شکاندیان.
بیرت نەچێ،
ئەوە پەنجەرەی هەستی من بوو.
چیتر وەك ئەوەڵین جارو
وەك لێخوڕی یەکەمین قەیاغی سەر دەریا،
بەترسەوە، هەنگاو نەنێی.

له من
له خۆی
له ئەو
بپرسه،
بۆ ئەوەی له هاتنتا رایسپێری،
ئەو داپیرەیەت بیر نەچێ
که نێوچەوانی ماچ کردی‌و
له ژێر لێوەوە پێی وتی: قوربانی تۆزی ژێر پێی ئەسپی کەحێل‌و
تەمەنی بەرەو پیری چووی عیشقی بم.
پێی بڵێ: ئامانەت بێ، خۆم‌و دەفتەرو ئەنگوستیلەو کل‌و کلدان مێخەك‌و
عیشقی سووتاوی من/ لای ئەو.
که ئێوارانت لێداهات،
له ماڵی دارشاتوویەکدا، ستر بگرەو
لەگەل خۆت، پڕ گیرفانی پاڵتۆکەت،
شاتوو هەڵگره.
چون من دەزانم، تۆ هەمیشه هۆگری گەڕانی،
که برسیت بوو،
شاتوویەك به روحی لێوانلێو له ئێشی منەوە بخۆ.
من ئەسیارم، ئەسیاری نیشتمان، ئەسیاری عیشق، ئەسیاری ئێش‌و تۆزێ
هەناسه،
ئەسیاری رۆحی پەراش پەراش بووی خودی خۆم‌و تۆ،
ئەسیاری نوێژی پڕ له تەهارەتی خۆم‌و خۆت،
ئەسیاری رۆژێکی لێوانلێو له حەنینی که تێیدا، یەکترمان ناسی،
ئەسیاری سیلاوی فرمێسکی پاکانەکانی تۆ،
ئەسیاری هاواری ئەو کۆترەی بۆ یەك چرکه هاته بەردەم پەنجەرەی
ژوورەکەت‌و رۆیی.



بڵێ، بزان کەی‌و چۆن‌و بۆ له کوێ،
چەتری تەنیاتر له خۆتت هەڵداوە.
تەماشا
من ئێستا له لێواری ئەو رووبارەدا، خەریکه ون دەبم،
که جارێکیان بەرێکەوت وەك ئەو پڕ بووین له رۆیشتنی نەرم‌و حیکایەتی
ناڵیمان،
هەموو کاتێ له خۆم دەپرسم،
بۆ نا، به ناڵی ئەوم وەك خۆی بناسیبایەو
بۆ هەتایه،
ببوایەم به ئەو.
بیرم دێ،
بیرت دێ؟
له لێواری ئەو رووبارەدا،
خوا بۆ یەکەمین جار ئیزنی داین
که عیشق وەك خۆی بناسین؟
٢٠٠٥

١_خۆراسان: ئافرەتێکی گەرمیانی بوو، به تومەتی ناموس، تیرۆرکرا
٢- زەریف: تەنیا ئافرەتێکی پەککەوتەیه له پاشماوەی تاوانی ئەنفال له سەرجەم خێزانەکەی.
٣-جەمیله: کچێکی ئەنفالکراوی زەریفه
٤-دەرویش عیسا: باپیری خۆمه

## ئێوارەیەک

زەحمەتە ئەم ئێوارەیە وەك پەلکەزێڕینەی پاش باران،
مووحیبەتم بەسەردا بباریێنیّو
وەك ڕەنووەبەفر لەسەر لێوی نارنجیی ئەو بتوێمەوە.
ئەم ئێوارەیە ریشی ئاڵتوونیی خۆر دەگرم و
دەڕۆم لەسیپەی دڵی ئەودا،
ئارام ئارام
هەناسەبارانی ڕۆحی دەکەم...



## زام

(١)

خۆشەویستیت ،
خوێنی بەربووی زامێکی قەبەیەو ئارام ناگریّ
بیّ قەرارم
لەتەنگترین سووقاقی ئەم غوربەتەدا بیّ قەراریت دەکەم
ببینە
هێدی بەرەوە
لەڕێژگەی ئەم سەرهەڵگرتنی لێوان لێو لەتەنگانەدا
دەمیّ هۆگری چاوەڕوانیو
تاو ناتاویّ بیّ ئۆقرەیی
سەرنجامیش خۆخواردنەوە لەکاسەی هیچ دا
بنواڕە
ئاسمانی سەرم تاوەتەزرەی لێدەباریّو
کلاّوەی هەردوو ئەژنۆم مۆر داگەڕاون
تەماشا
دوا سیگاری نێو پاکەتەکەم چۆن وێنەی بێکەسیم دەسووتیّ
هەر ئەویش وای پێوتم

درەنگ زانیت بەفری پاکبوونەوەی قووباد[1] لێرە داناکاو
خاوەنی دیوانی غووربەتیش[2] بۆ ئەبەد بەعەزابەوە دەسووتێ
درەنگ زانیت کاراکتەری شانۆی کەلاوەی نان[3] قامکی دۆشاومژەی خۆی
دەگەزێ
بۆ ئەو سەفەرەی لەمەنفادا خەونەکانی خنکان
ئەو وتی:
چۆن دڵت هات
دوائاوێزان بوونی خۆشەویستیت
بەتەرەبوونی خۆت و غووربەت گۆڕییەوە
درەنگ بوو
کە وتت مەهدی[4] شیعر بەعەزابی دایکیەوە دەکاتە پاروویەك زووقم و قووتی
دەدا
چیایی[5] بۆ ماوەیەك شیعر تەڵاق دەداو
هەڵمەت[6] وەك فیشەکە شێتە بەڕووی ڕابردووی خۆیدا هەڵدەشاخێ و
ئەو وتی:
ببینە وا خەریکە فالە[7] بەدەست گرێی چیرۆکێکی نوێوە شێت دەبێ
کوڕەکەی لەتیف[8] پڕ بەگەروو هاوار دەکا

---

١قوبادی جەلی زادەی شاعیر
٢محەمەد عومەر/ شاعیر
٣دڵشاد حسێن/ هونەرمەند
٤ مەهدی ساڵح/ شاعیر
٥ عیسا چیایی/ شاعیر
٦ لەتیف هەڵمەت/ شاعیر
٧ فایق ڕەحیم/ چیرۆك نووس



هەڕاج
لەم مەزادخانەیەدا شیعر بەهەڕاج
نەوەی فەرەجیش[9] بەقەد باڵای ئازاری تاقانەیەکی ئەنفالا هەڵدەزنێ

---

**(٢)**

هاتینەوە بەردەم قاپی دڵشکان و
چوینەوە خەرابخانەو
بوینەوە واریسی نیشتمانی کەلاوە
نەمانتوانی مەعزەرەت لەچۆلەکەیەك بخوازین
ئێمە هەروا بووین
کلاوکوڕەیەك هێلانەی خۆی بۆ کردینە سابات
نەمانتوانی خایەنەتی لێ نەکەین، چیمان کردو چۆن بووینە مەخسەرەی ڕۆژ، بەدەستی خۆ خۆمان نایە ژێر چەقۆیەکی هەتەرو هەر بۆ خۆشمان خۆمان هەناسە سارد کردو لەلێواری گەرووی نەهەنگدا خنکاین، ئەرێ بەڕاست هەڵهاتین بۆ ئەو ئارامی لەکۆشکی خۆیدا بمان خواتەوە، یان نەمانزانی ئەم هەڵهاتنە تاڵ تاڵ مووی چەناگەمان سپی دەکات، دەیسا خوا مەرگ تاقەتی دیوانی مەولەوی و نالی و گۆرانیشمان چوو، مەرگ خودایە نەمانتوانی ئازاری منالێکی ئەنفالی بێ باوان بلاوێنین.

**(٣)**

دەریا چەند چاوی تەنگە
تەنگتر لەتەنگەوەری ئەو دەریایەی بەنێویدا دەپەڕمەوە

---

٨ حسێن لەتیف/ شاعیر
٩ لەتیف فاتیح / شاعیر

قەدەر من دەباتە لێواری خنکان و
ئەوی خۆشەویستم دەباتەوە کۆگای ئازار
دەریا لەتاڵەسپیەکانی سەرم ورد دەبێتەوەو
منی پەشۆکاویش نازانم خۆشی دەوێم یان...

(٤)

کوێوە دەچی؟
شاری کوێران!
کەی دەگەڕێیتەوە باوەشی نیشتمان؟
نیشتمانی پڕاو پڕ لەخەم
نیشتمانی پێ بەستراو
نیبشتمانی وێستگەی تاوان
هۆ ووو نیشتمانی فەقیر
ئێستا بێ وار تر لەمن
گیانەوەرەکانی تۆیە
ئەدی دەبەنگ تر لەمن تەنها سیاسیەکانی تۆ

(٥)

کەهاتم لەبەر خۆوە
وتم ئولفەت بەغوربەتەوە دەگرم
بەدەم برینی دڕکەلآنی ڕێی سەفەرەوە
چارەنووسی خۆم خورد دەکەمەوە
تفێك لەو ڕۆژانە دەکەم کەڕۆشت گوێگرتن لەمۆسیقاو نەهاتەوە تەمەنی منداڵی
ڕۆیشت گەمەکانی منداڵی‌و نەهاتەوە کۆشی پڕ میهری دایکم



بەسەرچوو تەمەنی بلوغی‌و نایەتەوە دەست لەملانی باخچەکانی فەسڵی بەهار
کەهاتم وتم
مۆری عار لەتەوێڵمەوە فڕێ دەدەم‌و کەچی ئێستا ناشزانم چیم‌و کێم

(٦)

وتمان دەڕۆین لەمەنفادا بیر لەدانیشتن لەسێبەری کەڵەکی شوانێك دەکەینەوە، هەناسە بۆ عەزابی نیشتمان هەڵدەکێشین لەژێر چەرداخی سەپانێکدا دوور لەدەنگی تەقەی تفەنگی قەزەمەکانی بەرەی چەند چرکەیەك پشوو دەدەین، ئەرێ بشێ لەمەنفادا بمانپەرژێ بیرەوەریەکانمان بنوسینەوە؟ ئەرێ بشێ لەمەنفادا هەموو شتێکمان بیر نەچێتەوە؟

(٧)

مەنفا سەرمان دەخواو هیچیتر
مەنفا جوانی شیعرمان پێ دەتفێنێتەوەو هیچیتر
دەمان کاتە عیبرەت‌و
دانەکانمان جیڕ دەکاتەوە
لەمەنفادا لەکۆتایی فەسڵی چاوەڕوانیدا
خۆ خواردنەوە دەتکاتە سووتەمەرۆی کوانوی داپیرەیەك
بمرە
کەنەتوانی قفڵ لەتاڵی مەنفا بدەی‌و
منال بیتەوە لەمناڵی خۆتدا

(٨)

جەستەم برینێکە هاوتەمەنی باپیرمە، قسە بکە باپیرە گیان چەند جار تێلآت بەداپیرمدا دەکێشاو چەند جاریش لیّی دەپاڕایتەوە لەقوسورت عەفو بێ، قسە بکە باپیرەگیان ئەوێ دەم کەتاقانە خوشکەکەم لەدایك بوو جامانەکانتان





لەدەم و چاو هەڵپێکاو، کەمن لەدایك بووم وتتان ئۆخەی وجاخمان ڕۆشنە، ئەویێ دەم بوو باپیرە لەترسی شەپازلە مزرەکانی تۆ کەبنا گوێمی سورو شین هەڵدەگەڕان داپیرم وەك فریشتە پەیدا دەبوو دەیکردمە ژێر کراسەکەی بەری و منیش عەجولانە سەیری جەستەی سپی داپیرم دەکرد، چەند فەقیر بوو داپیرم تۆش چەند جەلاد، قسە بکە من خۆشم دەویێ ئەوەندەش ڕقم لێتە، چەند غەریبیت دەکەم ئەوەندەش لێت دوور دەکەومەوە، تکایە گەر هاتمەوە با لەئاوی مەجدەلیەکان خۆمان پاك پاك بشۆین،

**(٩)**

ئێستا ئیتر شەو باوەشی بەبۆن و بەرامەی عیشقامانا کردو
چیرۆکە وڕێنەکانی فالەش دادم نادا
چاوەڕوانی هەڵهاتنی ئەستێرەی بەختیش
فەلسەفەیەکی بەتاڵ بوو مانگیش گاڵتەی بەچارەنووسم دیێ
نەم توانی لەمەغریبانیێ بپارێمەوە
تا هیچ نەبیێ لەچامەی عیشقم هەڵژەنیێ و
پێم بڵیێ تەماشا ئەوە پەنجەرەی پاك بوونەوەیە
هەڵی گرنەوە با نەشکیێ

**(١٠)**

وەرە دانیشە زامی قەبەی ئەم سەفەری هەڵهاتنەم بۆنی سورمەی باڵی پەپولەی لیێ دیێو کزکز لەحەسرەتی فرمێسکی چاوی خۆیدا، خۆی دەخواتەوە، لەبێشکەی بیێ ئارامیدا کپ و بێدەنگ خۆی لەپەسێوی بیێ ئارامی دڵی تۆ ئاخنیوە، بیێ سروەیە ئەم هەناسە پەژموردەیە، پەژموردەیە ئەم ڕۆحە بیێ ئۆقرەیە، بیێ ئۆقرەیە ئەم خەیاڵی ڕۆشتن بەرەو نویێ بونەوە لەعشق، چی زوو وا پەژیوان بوویتەوە لەدوا بڕیاری ئاوێزان بوون، بەکەف و کوڵی سەفەر، سەفەر تەلاقی دای یان...



**(١١)**

برۆ بابچین لەماڵی تەنیایدا
لەخشپەی ژێر پیێی ئاو بپاڕێینەوە
لەگوناهی گەورە بوون بمانشواتەوە
چی داوە لەباسی سەفەر
قەت بیرت لەوە نەکردۆتەوە
باوکت گوناهی گەیو
کەتۆی خوڵقان و
گەورەش بوو
کەفێری کردی
لەدێرێکدا سەگێکی بەوەفا
جوانترە لەمرۆڤێکی بیێ سەلیقە
من گوناهم نیە کەنەم توانی
بەخوێنی خرۆکەسورەکانی لەشم بنووسم
باوکم ئینسانێك بوو لەئاو
تۆفانی شووم
ڕیشەکانی هەڵکەنیێ و
ئیدی ئەو نەیتوانی پێمان بڵیێ:
گەورە بن لەئاو
لەئاودا پاك بنەوەو
لەئاودا مناڵ بنەوە
لەمناڵ بوونەوەدا
بچنەوە باوەشی ئاو

ئەستەمبول ٢٠٠٠





# گریان بەبێ فرمیسک

(١)

ڕۆژێك هەموو هەستم وەك گەورەیی گریانی دڵی تۆ،
لەدیداری خوادا.. گریا
گریاو
خواش نەیپەرژا کوڵی دڵی ژیوان کاتەوە..
گریاو
بەدەم گریانەوە چامەی لەنووری خوا پاکتر هانی،
خوێندەوە..
گریاو
شیفاعەتی بۆ ئەو کلاۆفشنەیە کرد،
کە بۆ یەکەمین جار پاسپۆرتی پەڕینەوەی لێرەوە وێدا..
گریاو
بەدەم گوێگرتن لە سەمفۆنیای هاتنی (ئەو)ەوە،
دەیوت:
کە هاتی وەك سپیایەتی هەوەڵین جار وەرە،
تکایە بیرت نەچێ..
دەیوت:





دەیوت:
کە بەیانیان سەردانی باخچەی یادەوەرییەکانت کرد،
لەتێ لەدڵم لەوێیە،
تکایە لێت ون نەبێ..
لەوێ گوێ لەگریانی بێ فرمێسکی بوونم وەك خۆی بگرە،
کە ناتوانێ لە(ئەو)دا نەبێ بە گۆرانیەکی حەنین..

(٢)

هەندێ جار دەبمە چۆلەکەیەکی بزێوو
هەندێ جاریش وەك لاسارییەکانی منالّیو
هەندێ جاریش وەك فەقیرییەکانی گەورەبوونم،
دەگەمەوە بەردەم عەرشی سپی دڵت..
لێت دەپرسم:
ڕێی ماڵی خوایەتی من و تۆ لێرەوەیە؟
یان دەبمە لەتێ لە(ڕۆح)ت،و
ببورە بۆ هەمیشە پەژیوان نابمەوە،
لەجاڕدانی خوایەتی عیشقمان..
بانگم بکە...
من (ئەو)م و
(ئەو)یش من..
بانگم بکە ...
فتیلەی چرایەك بسووتێنە،
تا ڕێی هاتنم لێ گووم نەبێ..
بانگم بکە...
گۆزەیەك ئاو لەسەرو بنی گوڵەکان بپرژێنە،

تا لەهاتنما وەنەوشەیی بچنەوە..
بانگم بکە..
ڕەنگی پەنجەرەکان بگۆڕە بەپەمبەیی،
تا لەگەیشتنما گوێم لەسۆزێکی هێمن بێ..
بانگم بکە..
بەو دەف ژەنە بڵێ،
کە(ئەو) هات با زیڕەی ڕۆحی دەفت شار بشڵەژێنێ..
بانگم بکە...
بەو بلوێرژەنە بڵێ،
کە(ئەو) هات با ئاوازێك بۆ ئەم گریانەم دانێ..
من ماڵم بۆ لێواری ئاوێنەیەك لە ئاو دەپێچمەوە،
کەلێون لێو بێ لەوێنەی تۆ..
من هەناسەم لە بۆنی عەتری ئاوێنەیەك هەڵدەژەنم،
کەڕۆژێك زوڵفی خەنەیی تۆ لەخۆی دابێ..
من گرێی چیرۆکی ڕازێك دەکەمەوە،

(٣)

عەیامێکە لەبەر حەرامبوون کەس نەینوسیوەتەوە..
من دەچم بۆ لێواری دەریایەك،
کە ئاوێنەی بینینی تەعاروفەکانی یەکترناسینمان بێ..
من دەچم بۆ میوانی ماڵی دڵی دەریایەك،
کەتەنیا لەتۆ بچێو
وەك تۆ پڕ بێ لەبوونو
نوێژ بۆ سرووتەکانی هاتن بکا..
من دەچم بەیجووری هەڵوەرینی یادەوەرییەکانی مناڵیم دەکەمو



لەبۆنی دووکەڵی سووتانی بخوردەکانی سەرڕێ هەڵدێم..
من دەچم لەباڵندەیەکی دەریاوان دەپاڕێمەوە،
مۆڵەت لە دەریا بخوازێ،
هەرتکمان لەگەڵ خۆی بۆ لای ئەستێرەی سیوەیل بباو
بەهارێك بە پاشۆڵی با دەمی لەعەشق هەڵژەنراوەوە،
دێنەوە..
مۆڵەت بدە گەورەی من..
هاتووم پێت بڵێم،
نیوەی ڕۆحو
نیوەی دڵو
گشت تەمەنی،
هەرتکمان،
بوون بەیەك..
مۆڵەت بدە گەورەی من..
هاتووم پێت بڵێم،
هەمیشە لای ئەو ڕووبارە..
لەئاوێنەی دڵی ئەودا،
تۆ دەبینم..
ئاخر لەوێ خۆمم دی باسی نهێنی نێوان خۆییو تۆی بۆ ماسیەکان،
دەگێڕایەوە..
ماسیەك لێی پرسیبوو..
کەئەو هەمیشە ڕووخساری لەئاوێنەی دڵی ئەم ڕووبارەدایەو
غەریبی ئێرە دەکا،
بۆچی تەشریف ناهێنێ؟
ئەویش پێی وتبوو گوێگرە ماسیە جوانەکە،

(٤)

ئەو ئێستا لێرەیە..
وەلێ لەترسی ئەوەی کەس نەیبینێ،
خاکییانە خۆی پۆشیوەو
تەنها چاوی چەپی عەشقی من دەیبینێ..
مۆڵەت بدە گەورەی من..
گوێت لەبانگی هەناسەی منە؟
بانگت دەکا..
ئەو لەدوو توێی پەڕەی دڵی ماسیەکدا،
نامەیەکت بۆ دەنووسێ..
بانگت دەکا..
بەچاوی ڕاستی ڕۆحت بیخوێنەوەو
بەچاوی چەپی ڕۆحت نهێنیەکانی بپرێزە..
من چاوەڕوانم..
کەی وەك خۆت سپی دێی؟
من چاوەڕوانم ..
مۆڵەت بدە گەورەی من..
سارایەکی بێ سنوور بۆنی تەڕی گڵی پاش باران،
لەسەر موژگانی  چاوەکانت  چێ بووەو
لەمەقامی ئەڤین دا کڕنۆش دەبا..
ببینە سەمای چۆلەکەیەکی گریاو..
بیخوێنەوە حەسرەتی گریانی بێ فرمێسکی من..
بیدڕێنە لاپەڕەکانی چاوەڕوانی..



بینوسەوە پڕۆژەی دەقێکی نەنوسراو..
مۆڵەت بدە گەورەی من ..
تا نوسینەوەی سرووتێکی تر...